# تێکستی قورئان و مێژوو

## ئایا مێژوومان ڕەنگدانەوەی گوتاری قورئانە؟؟!





نووسینی : سەلام ناوخۆش

# تێکستی قورئان و مێژوو

## ئایا مێژوومان ڕەنگدانەوەی گوتاری قورئانە؟؟!

سلام ناوخۆش

باشوور ٢٠١٦

ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : تێکستی قورئان و مێژوو

نووسینی : سەلام ناوخۆش

بابەت: ئایینی

بڵاوکار: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

دیزاین : محمد خەتی

چاپ: یەکەم/ ٢٠١٦ - هەولێر

کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
دیزاین - چاپکردن - بڵاوکردنەوە
٠٧٥٠٢٢٣٣٨٦٨
٠٧٧٠٤٥٨٩٠٧٦
هەولێر - شەقامی گۆڕستان




لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٦٥٧) ی ساڵی ٢٠١٥ ی پێدراوە

07504671394
hawler.chap@gmail.com

# پـێـڕسـت

# ﺑﻪ ﻧﺎﻭﯼ ﺧﻮﺍﯼ ﮔﻪﻭﺭﻩ

**ﺩﻩﺭﻭﺍﺯﻩ :-**

ﻫﻪﺭ ﺳێ ﺋﺎﻳﻪﺗﯽ " ﮔﻮێ ڕﺍﻳﻪڵﯽ ﺧﻮﺩﺍ ﻭ ﭘێﻐﻪﻣﺒﻪﺭ ﺑﮑﻪﻥ ..." , " ﮔﻮێ ڕﺍﻳﻪڵﯽ ﺧﻮﺩﺍ ﻭ ﮔﻮێ ڕﺍﻳﻪڵﯽ ﭘێﻐﻪﻣﺒﻪﺭ ﺑﮑﻪﻥ ..." ﻫﻪﺭﻭﻩﻫﺎ " ﻫﻪﺭ ﮐﻪﺳﯽ ﮔﻮێ ڕﺍﻳﻪڵﯽ ﭘێﻐﻪﻣﺒﻪﺭ ﺑﮑﺎﺕ , ﮔﻮێ ڕﺍﻳﻪڵﯽ ﺧﻮﺩﺍﯼ ﮐﺮﺩﻭﻭﻩ ..." ﺗێﮑﺴﺘﯽ ﻗﻮﺭﺋﺎﻥ ﻭ ﺳﻴڕﻩ ﻭ ﻓﻪﺭﻣﻮﻭﺩﻩ ﺑﻪ ﻳﻪﮐﻪﻭﻩ ﺩﻩﺑﻪﺳﺘﻨﻪﻭﻩ . ﻟﻪﻣﻪﺩﺍ ﺩﻩﺭﺩﻩﮐﻪﻭێ ﺩﻩﻗﯽ ﺗێﮑﺴﺘﯽ ﻗﻮﺭﺋﺎﻥ ﻭ ﺳﻴڕﻩﯼ ٢٣ﺳﺎڵﯽ ﭘێﻐﻪﻣﺒﻪﺭﺍﻳﻪﺗﯽ ﻟﻪﮔﻪڵ ﻓﻪﺭﻣﻮﻭﺩﻩﯼ ﺩﺭﻭﺳﺘﯽ ﭘێﻐﻪﻣﺒﻪﺭ, ﮐﺮۆﮐﯽ ﺋﻪﻡ ﮐﺘێﺒﻪ ﭘێﮑﺪﻩﻫێﻨﻦ .

ﻣﻪﺣﻤﻮﻭﺩ ﺋﻪﺑﻮ ڕﻳﻪ ١٩٥٧ , ﻝ ٣٩ ﻧﺎﻫﻪﻗﯽ ﻧﻪﺑﻮﻭ ﺑڵێﺖ : " ﺩﻳﻦ ﺑﺮﻳﺘﻴﻪ ﻟﻪ ﺗێﮑﺴﺘﯽ ﻗﻮﺭﺋﺎﻥ , ﺳﻮﻧﻨﻪﯼ ﮐﺮﺩﺍﺭﻩﮐﯽ –ﺳﻴڕﻩ , ﺳﻮﻧﻨﻪﯼ ﻗﻪﻭﻟﻴﯽ – ﻓﻪﺭﻣﻮﻭﺩﻩ ."

ﻟﻪ ﺑﻪﺭﮔﯽ ﻳﻪﮐﻪﻣﯽ ﮐﺘێﺒﯽ ﻣێﮋﻭﻭﻩﮎ ﻟﻪ ﭘﻪﺭﺗﻪﻭﺍﺯﻩﻳﯽ ﻗﺴﻪﻣﺎﻥ ﻟﻪ ﺳﻪﺭ ﭘﻪﺭﺗﻪﻭﺍﺯﻩﺑﻮﻭﻥ ﻟﻪ ﻧێﻮ ڕێﺰﯼ ڕﻩﻭﺗﯽ ﻣﺎﺭﮐﺴﯽ ﻭ ﻧﻪﺗﻪﻭﻩﮔﻪﺭﯼ ﮐﻮﺭﺩ ﮐﺮﺩ . ﻧﻪﺗﻪﻭﻩﯼ ﮐﻮﺭﺩ ﻭﻩﮎ ﺑﻪﺷێﮏ ﻟﻪ ﺋﻮﻣﻪﯼ ﺋﻴﺴﻼﻣﯽ ﻣﺎﻭﻩﻳﻪﮐﯽ ﺯۆﺭﻩ ﻟﻪ ﻧﺎﻭ ﻣێﮋﻭﻭﯼ ﺩﻩﺭﻩﻭﻩﯼ ﻗﻮﺭﺋﺎﻥ ﺩﻩﮊﻳﻦ , ﭼﻮﻧﮑﻪ ﺋﻪﻭﻩﻧﺪﻩﯼ ﻓﻪﺭﻣﻮﻭﺩﻩﯼ ﻻﻭﺍﺯ ﻭ ﻫﻪڵﺒﻪﺳﺘﺮﺍﻭ ﻭ ﺧﻮﺭﺍﻓﻪ ﺋﺎﻣﺎﺩﻩﮔﯽ ﻟﻪ ﮊﻳﺎﻧﻤﺎﻥ ﻫﻪﻳﻪ , ﻗﻮﺭﺋﺎﻥ ﻭ ﺳﻴﺮﻩ ﭼﺎﺭﻩﮔﯽ ﺋﻪﻭﻩﻧﺪﻩ ﺋﺎﻣﺎﺩﻩﮔﻴﺎﻥ ﻧﻴﻴﻪ! ﺋﻪﻭ ﺩﻳﺘﻨﻪﯼ ﻟﻪ ﻧﺎﻭ ﻣێﮋﻭﻭ ﺑﻮﻭﻥ , ﻧﻪﮎ ﻟﻪ ﻧﺎﻭ ﺩﻩﻕ ﺑﻮﻭﻥ , ﻫۆﮐﺎﺭێﮑﻪ ﻗۆﻧﺎﻏﯽ ﭘێﻐﻪﻣﺒﻪﺭﺳﺘﺎﻥ , ﻗۆﻧﺎﻏﯽ ﺩﻩﻭڵﻪﺗﯽ ﭘێﻐﻪﻣﺒﻪﺭ , ﺩﻭﻭﺑﺎﺭﻩ ﻧﻪﺑۆﺗﻪﻭﻩ ﻫﻪﺗﺎ ﻟﻪ ﺯﺍﮐﻴﺮﻩﯼ ﺗﺎﮐﯽ ﻣﻮﺳڵﻤﺎﻧﺪﺍ!

لە بەشی دووەمدا قسە لە سەر دیاردەکانی دین بە تایبەتی لە کۆمەڵگای کوردەواری دەکەین هەروەها کاریگەری و هەژموونی ئەو دیاردانە لە سەر تێڕامان و هزری متەنەوەری کوردی دەکەین . لێرەدا دەپرسین کورد پێویستی بە شۆڕشێکی فەرەنسی ئاسا یە لە سەر دام و دەزگای دینی کوردی؟؟ هەتا ماڵوێرانی دەوڵەتانی وەك عیراق و سوریا دووبارە بێتەوە ؟ لە بەشی سێیەمدا تیشك دەخەینە سەر ئینتیمای دینی و ئینتیمای قەومی . غیابی هەر یەکەیان دەبێتە پەرتەوازەیی لە نێو کۆمەڵگای کوردەواری , بە تایبەتی حیزبی ئیسلامی کوردی.

لە کتێبی مێژووەك لە پەرتەوازەیی ئاماژەمان بەوەدا حیزب و متەنەوەری کوردی مارکسی و ناسیۆنالیستی چەپی کوردی زیاتر لە سەدەیەك هەر مەینەتیان بۆ کورد هێنا , دەپرسین ئاخۆ عەوام و ڕۆناکبیری ئیسلامی کوردیش هەمان هەڵە دووبارە دەکەنەوە ؟؟ دەبی بەشێکی ئەو پەرتەوازەییە پەیوەست نەبێت بە پاسیڤبوونی ڕۆناکبیری کورد لە گرێنەدانی تێکستی قورئان بە ژیان و دۆزی کوردەوە ؟؟ گەر وایە , تاکەی لە نێو مێژوو و لە دەرەوەی قورئان بژین؟؟

ئەم چەند دێرە لە ڕوانگەی عەقلانیەتەوە- بە گەڕخستنی عەقڵ لە تێگەیشتنی دەقی قورئان , نەك عەقلگەرایی, نووسراون .

**سەلام ناوخۆش**

٢٩/ ٥/ ٢٠١٥

# بەشی یەکەم

## سێکوچکەی دین : قورئان + سیرە + فەرموودە

لەدەروازەی بەشی یەکەمدا ئاماژە بە پێکهێنەرەکانی ئیسلام دەکەین , مەحموود ئەبوریە ١٩٥٧ , ل٣٩ باس لە پێکهێنەرەکانی ئیسلام دەکات,کە بە شێوەی زنجیرەیی بریتنین لە قورئان, سیرە , فەرموودە .

### یەکەم / قورئان

کەلامێکی ئیلاهی خودایە , یاخود مانیفیستۆی کۆتایی مێژوویی ئاسمانە بۆ مرۆڤ . دوور لە شوناسی ئایدیۆلۆژی , خودا ڕێزی بۆ مرۆڤ بڕیار داوە . کاك شێخ لە لاپەڕە ١٥١-١٥٤ ی کتێبی بە زمانی حاڵ ئاماژە بەوە دەکات کە ئەوە مرۆڤەکانن قەدری ئەو هەموو ڕێز و بەخشینە نازانن , بۆیە مرۆڤی هاوشێوەکراو بە ئاژەڵ یا نزم تر . ئایەتی ( خودایە , پەروەردگارا قەومەکەم پشتیان لەم قورئانە کرد ) ئەو پشتلێکردنە ڕەگێکی پەرتەوازەیی لە کۆمەڵگا دروست دەکات .

### دووەم / سیرە

سیرە یا قورئانی کردارەکی نێو کۆمەڵگا . پێغەمبەر لە یازدە ساڵی حوکمڕانی مەدینەدا توانی پێغەمبەرستان دروست بکات , چونکە تەحسین غەریب واتەنی لە پێغەمبەرناسی پێغەمبەر توابۆوە لە ناخی ئینسانی

مەدینە . ئەوەش ئاسایی بوو , چونکە پێغەمبەر خولقی قورئان بوو , قورئانێکی کردارەکی نێو خەڵك بوو .

سیرە بە دروستی بە ئێمەی کورد نەگەیشتووە , بەڵکو ئەوەی گەیشتووە فەرموودەیە!

## سێیەم / فەرموودە

مەحموود ئەبوریە لە ل٣٩ دا دەڵێت فەرموودە لە دوای (قورئان) و (سیر)ەوە دێت . خۆشەویست لە ترسی ئەوەی دەقی قورئان و دەقی فەرموودە لە لایەن هاوەڵەکانیەوە تێکەڵ یەك بکرێن , سەرەتا پێشگیری لە نووسینەوەی فەرموودە کرد , نەك قورئان و سیرە . هەر لە سەردەمی ئەو و ئەبوبەکر و عوسمان قورئان بە تەواوی نووسرایەوە , هەتا لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا بە سەر تەواوی مەملەکەتدا دابەشکرا.

لە سەردەمی ئیمامی عەلیدا , دوو شتی گرینگ ڕوویاندا :

١. فیتنەی دابەشبوونی دەسەلأتی ئیسلامی لە نێوان عەلی و معاویەدا
٢. دروستبوونی کۆمەڵگای غەیرەعەرەبی ئیسلامی

لەو فیتنەیەدا , پاش تیرۆرکردنی ئیمام عەلی هەم کۆمەڵێك بە ناوی خەواریج پەیدابوون و شیعە و سوننە لە قاڵبی بەرایی دەرکەوتن هەم کۆتایی بە حوکمی شورا هات , جارێکی تر دەسەلأتی قەبەلی و ماڵباتی بە بۆیەی ئیسلامی دەرکەوتن!

سەبارەت بە خاڵی دووەم , بۆئەوەی ئەو غەیرە عەرەبانە تەواو لە قورئان بگەن , سەر و بۆر ...بۆ وشەکانی قورئان کرا . لە نێو ئەو نەتەوە

غەیرە عەرەبانە کەسی وەك بوخاری و ئەبو داود و ترمزی و نەسائی و ئیبنوماجە و سیبەوەیی...دەرکەوتن.

لە سەردەمی ئیمامی عەلیەوە تاکو دەرکەوتنی ئیمام بوخاری ١٩٤-٢٥٦ , واتە دوو سەدە فەرموودە نەك سیرە تەواو کۆنەکرایەوە ! لەو ماوەیەدا زۆر کاربەدەستی پاك و بێگەرد دەرکەوتن هەروەها کاربەدەستی خراپیش دەرکەوتن , بۆ نموونە تەنیا لە زەمەنی بوخاریدا , کرێکار ٢٠٠٩ , لە ل١٩-٢١ باسی زانایەکی بە ناوبانگی وەك زوهلی نیسابووری دەکات کە لە حەسوودی بردن بە بوخاری وتویەتی : " و الله ناهێڵم کەسێك بچێتە کۆڕی بخاری و بێتەوە کۆڕی من , ناشهێڵم من و ئەو لە شارێکدا نیشتەجێ بین!!

-دوهلی –زوهلی موفتی رەسمی دەوڵەت بوو , فشاری زۆری بۆ بخاری دروست کرد , تا بوخاری ناچاربوو , نەیسابوور بەرەو بوخارا بەجێ بێڵێت!! . "

لە بوخاراش زاتی وەك بوخاری لەگەڵ ئەمیری بوخارا نەگونجا , خالید ئەحمەدی والی بوخارا فەرمانی نەفی کردنی ئیمام بوخاری دەرکرد ,کرێکار ل٢٢.

بوخاری و سەدانی وەك بوخاری لە قوربانیەکانی کاربەدەستی ( ئیسلامی مێژوویی نەك عەقیدەیی ) بوون .

لە کۆتاییەکانی حوکمڕانی ڕاشیدی دا , ئیسلامی مێژوویی لە ناو کاربەدەستان دروست بوو . جارێکی تر ئەوەی پێغەمبەر لێی دەترسا لێرە و لەوێ زیندوو کرایەوە : ماڵباتی خانەدان لە سزا دەرباز بن , کوڕ و کچی هەژار سزایان لە سەر پەیڕەو بکرێت .

ئیسلامی مێژوویی , ئیسلامێکی بێ گیانە جێگای دەیان کاربەدەستی ستەمکاری لێ دەبێتەوە , کەچی هەلگرانی ئیسلامی عەقیدەیی لە دەرەوەی دەسەلأت مانەوە یان وەك بوخاری شار بە دەر کران .

فەرموودە جیا لە قورئان و سیرە , پانتایەك لە ئیسلامی مێژوویی تێئاخنراوە , بۆیە فەرموودەناسی پەیدابوو هەتا فەرموودەی لاواز و هەڵبەستراو ...لە فەرموودەی دروست صحیح جیابکرێتەوە . ئەو فەرموودە لاواز و هەڵبەستراوانە زادەی کاربەدەستان و زانای وەك دوهلی و کەمزان و لاوازەکانە . لێرەدا تەواو هەرسی ئەوە دەکەم بۆچی ( شێخی ئەزهەر ) لەگەڵ مێنتاڵ میلیتاریستی - عەقلیەت عەسکەری وەك سیسی ڕێککەوت کودەتا لە سەر مورسی بکات و لە ناکامیش ( موفتی رەسمی دەوڵەتی میصر ) وەك دوهلی فەرمانی ئیعدامکردنی پەسەند بکات!!

قورئان کەلامی خودایە , سیرە پێغەمبەرستانی دروست کرد , چونکە زاتی پێغەمبەر قورئانێکی کردارەکی دەوڵەت بوو لە نێو خەڵك , هەرچی فەرموودەیە وەك مێژووی تەبەری ٢٢٤-٣١٠ درەنگ نووسرایەوە بەشێکی بچووك لە کاری شەش پێشەواکە (بوخاری , موسلیم , ئەبو داود , ترمزی , نەسائی , ئیبنوماجە ) و ئەوانەی ناسراون بە لاواز و هەڵبەستراو بە پێوەر و ستاندەری قورئان , هەلگری ئیسلامی مێژووی و کەلتوورین , نەك عەقیدەیی .

هەر ئەو بەشە بچووکەش تارمایەکی هەژموونداری لە کۆمەلگادا دروست کردووە و جێی کردۆتەوە بۆ ئیتیقاتی میللی بە ناوی ئیسلامی میللی . ئەو جۆرە ئیسلامە ئیوە کەلتوورییە , پەرتەوازەیەکی لە نێو تاکەکانی کۆمەلگا دروست کردووە!

## پەرتەوازەیی :

پەرتـەوازەیی لـە ئیختـیلاف جودایـە . پەرتـەوازەیی درز و کـەلێن لـە ڕیزی موسڵمانان دروست دەکات , کۆمەڵگا بۆ چەند ڕەگەزێکی ناتەبا دابەش دەکـات . هەرچـی ئیختـیلاف بوونـە , ئـەدەبی خـۆی هەیـە , میکـانیزمێکی عەقلانیە هەتا سەرنەکێشێ بۆ پەرتەوازەیی .

گوتاری قورئان کار لە سەر یەکگرتوویی دەکات , نـەك پەرتـەوازەیی . هەندێ فەرموودە گێـڕەوە و توێـژەر ئامـاژە بـە فەرموودەیـەك دەکەن , کـە ئامـاژە بـە پەرتـەوازەیی دەکـات . عەبـدالرەحمان صـەدیق لـەو بارەیـەوە دەبێژێت : " گرینگ نیـیە کـێ فـەرموودەی ڕوایـەت کـردوە , بـەڵکو ئـەوەی گرینگە ئەم فەرموودەیە چی هەڵگرتووە .

لەو ڕوانگەوە دەپرسین فەرموودەی " پەرتەوازەیی " لە کوێی گوتـاری قورئانە ؟ یا ئەویش بەرهەمی مێنتاڵی کاربەدەستانە لـە منداڵدانی مێـژوو لە دایك بووە؟

## پوچەڵکردنەوەی " فەرموودەی " پەرتەوازەیی

سەرەتا ئاماژە بە دەقی " فەرموودەکە " دەکەین , لە پاشان بە ستاندەری قورئان و سیرە دەیپێوین .

## چەمکی فەرموودەکە

"جوو بۆ ٧١ گرۆھ جیابوونەوە , تەنیا یەکیان بۆ بەھەشتە , نەصارا بە سەر ٧٢ گرۆھ دابەش بوون , تەنیا یەك بۆ بەھەشتە , سوێند بەو کەسەی کە نەفسی موحەمەدی بە دەستە , ئومەتەکەم بە سەر ٧٣ تاقم دابەش دەبن , ٧٢ی بۆ ئاگرە , تەنیا یەکێکی بۆ بەھەشتە . لە پیغەمبەر دەپرسن ئەو گروھە کێیە ؟ ئەویش فەرمووی جەماعەت ."

لە تەمەنی پەنجا ساڵیمدا (دە)یان جار گوێم لە مەلای کورد بووە , کە ئەو وتەیان دووبارە و سێ بارە کردۆتەوە بە تایبەتی لە ھەشتاکانی سەدەی بیستەم .

دوو مامۆستای بەرێز لە سەر بنیاتی دوو سەرچاوە پیرۆزەکەی ئیسلام , قورئان و سیرە , شرۆڤەی ئەو فەرموودەیەیان کردووە .

ئەویش ھەردوو مامۆستای بەرێز حاکم مەتیری و حەسەن سەقافن , نوسەری بەرێزیش یوسف مەلا خەلیل ڕاکانی ھەردوو بەرێزی کردۆتە کوردی و ئاکی کوردی پێ ئاشنا کردووە , ساڵی ٢٠٠٩ بەندەش وتارێکی لە ئینگلیزیەوە کردە کوردی , کە بە بەڵگە دەیسەلمێنێ کە کاتێ پێغەمبەر عائیشە خانی خواستووە تەمەنی لە نێوان ١٩-٢٢ بووە , نەك ٩ ساڵی !

دوورخستنەوەی دەق لە ھەژموونی کلتوور دا , وای کردووە زۆر ناوەندی ھزری دروست ببێت, کە ئەو جۆرە وتانە بە تۆزی بەربا بناسێنن .

ئیبن حەزم باوەڕی وایە , فەرموودەکەی سەرەوە لاوازە , هەرچەند ئیبن تەیمیەش فەرموودەی سەرەوە بە (صحیح-دروست ) دادەنێت , هەروەها دەڵێت :هەرکەسێك ئەو ٧٢ گرۆکەی دی هەموویان بە بێباوەڕ بزانێ ئەوا پێچەوانەی قورئان و سوننەت و کۆڕای هاوەڵان و شوێنکەوتووانی گوتووە _ل٧٨ "

قورئان وسیرە وەك " دەستوور " و " یاسا " وان , نابێت هیچ یاسایەك بە پێچەوانەی دەستوور بێت . لە دەستووردا بنەمایەکان هەن لە یاساکاندا درێژەیان پێدراوە , بەمجۆرە دەستوور دەبێتە پێوەر بۆ ڕاست و دروستی فەرموودە , بۆیە لە نەزەر عەبدولرەحمان صەدیق دروستی فەرموودە لەوە دانیە کێ ڕیوایەتی کردووە , بەڵکو ئەم فەرموودەیە هەڵگری چ هەواڵێکە " ئەو هەواڵەش بێ گومان نابێت هیچ هەمفدژیەکی لەگەڵ دەقی قورئان هەبێت .

ئەو پوچەڵکردنەوە و ڕوونکردنەوەیە شتێکمان پێدەڵێت ئەوەی سۆفی( قادری +نەقشەبەندی + ئەزهەری ...)و مەزهەبی و سەلەفی و حیزبی ئیسلامی کوردی دروست کردووە , تێگەیشتن لە ئیسلامە , نەك خودی ئیسلام .

شەرمەزاری نییە لە هیند چەند سەد دینێك و لە ئەوروپا چەند دینێك پێکەوە بژین...ئێمەی موسڵمانی (دە ) گروە نەتوانین پێکەوە بژین؟؟ لە دوای قورئان ئەوەی گرینگە فەرموودە نییە , بەڵکو ( سیرە )یە , چونکە سیرە فێری بیرۆکەی ( هاولاتیبوون)مان دەکات هەروەها وەسیقەی

مەدینــە باســی پێکــەوەژیانی موســڵمان و جــوو , نەصــرانی , هاوبــەش پەیداکەرمان دەکات .

## دەوڵەتی هاوڵاتی و دەوڵەتی تاك- دینی

وەسیقەی مەدینە زامنی پێکەوەژیانی ڕاجیاوازی و دین جیاوازەکانە.

لە خوێندنەوەی زمانەوانی دوو ئایەتدا , وێنەی ژیانی دنیا و ژیانی قیامەت دەردەکەوێت . هەموو موسڵمانێك یەقینێکی تەواوی هەیە , کە زاتی خودا موحتاجی موسڵمانبوون و نا-موسڵمانبوونی تاکەکان نییە , بەڵکو ئەوە تاکەکانن موحتاجی زاتی خودان , ئەو موحتاجبوونەی مرۆڤیش بە خودا ئەزەلیە :

ئیلاهی

ئەوان موحتاجی ئافەرین و سوپاسی

دەسەڵاتدارێکن , سەرمایەدارێکن

بەندەش سەد جار موحتاجی

بارك الله زاتی تۆیە .

ئەو پۆلێنکردنەی دنیا و قیامەت لای خودا ئازادکردنی تاکەکانە کە چی هەڵدەبژێرن لە دنیادا , قەزاوەتی خوداش لە قیامەتە :

## ئازادی دنیا و پێکەوە ژیان

خودا لە سورەتی کەهف دا مرۆکانی ئازاد کردووە کە چ باوەڕ و عەقیدەیەك هەڵدەبژێرن هەروەها ئەوە خودایە دوور لە هەموو ئایدیۆلۆژیایەك ڕێزی لە مرۆڤەکان ناوە , بەڵام ئەوە مرۆڤە , هەندە نمەك حەرامە بەو هەموو بەخشینەی خودا , ڕێزپەڕی دەکات و خۆی دێنێتە ڕێزی ئاژەڵ !

خودا لە ئایەتی (٦٢ )ی سورەی بەقەرە هەموو باوەڕدارەکانی لە دنیا ئازاکردووە : " ئەوانەی خاوەن باوەڕن ( موسڵمانن ) و ئەو کەسانەش کە جوو و نەصرانی و سائیبین , ئەگەر باوەڕیان بێ و ئاکار چاك بن , ڕۆژی پەسلان خودا پاداشتیان دەداتەوە , نە هیچ ترسێکیان لە سەرە , نە خەم دەخۆن. "

هەرچەندە مامۆستا نزامەدین لە ل٢٧ ی تەفسیری گوڵشەن دا دەنووسێت : " بێگومان لێرەدا کە باسی ئەو ئایینانە دەکات , مەبەست ئەوانەیانە کە لە پێش هاتنی ئیسلامدا ژیاون ." بەڵام وشەی ( هادوا ) و ( نصری ) دوو وشەی دوای زەمانی تەورات و ئینجیلن , کەواتە وشەکان واتا و فۆرمی دوای زەمانی موسا و عیسا پێغەمبەرن , بۆیە وشەکان لەگەڵ لێکدانەوەکەی ئێمە یەکدەگاتەوە !

لە سیرەشدا هاتووە پێغەمبەری ئیسلام جیرانی جوو , هاوبەش پەیاکەری هەبووە هەروەها هەر زاتی پێغەمبەر قەرزاری جوولەکە بووە , کەواتە لە سیرەدا کۆمەڵگایەك هەبووە , شوێنی هەموو باوەڕەکانی تێدا بۆتەوە .

وەسیقەی مەدینە یەك مەرجی ناوەکی و دەرەکی تێدا هەبووە :

مەرجی ناوەکی وابووە , کە خوێن و نامووس...ی هەموو هاولاتیەکان بە موسڵمان و غەیرە موسڵمان پارێزراو بێت .

مەرجی دەرەکیش ئەمنی جیوگرافی مەدینە لە دوژمنی دەرەکی پارێزراو بێت , غەیرە موسڵمان بۆی نییە پەیمانی لەگەڵ دەسەلاتی قورەیشیەکانی مەککە گرێبدات.

## ڕۆژی قیامەت ... ڕۆژی قەزاوەت

چۆن ئایەتی لا اکراه فی الدین دنیانامێزییە , ئایەتی خوارەوەش کە ئایەتی ١٧ای سورەتی حەجـە , ئایەتێکی قیامەت نامێزییە , چونکە خودا لە دنیا ئازادی کردوون , بەلام لە قیامەتا دەستی بەستوون و دەمی گرتوون ناتوانن جولە و فزە بکەن . ئەوانەی لە ئایەتی ٦٢ ی بەقەرە دا لە دنیادا ئازادکراون , لە قیامەت دا دیلن و ناتوانن فزە بێ ئەمری خودا بکەن .

" ئەوانەی بڕوایان هێنا و ئەوانەی جوولەکە و سوببی و نەصرانی و مەجووسی و ئەو کەسانەش شەریك بۆ خودا بڕیار دەدەن , دیارە خودا " ڕۆژی سەلا – پەسلان " لە یەکیان جیادەکاتەوە و بە کاری هەمووان ڕادەگا . دیارە خودا لە هەموو شت بینیارە ."

دادگای خودا بۆ جودایی باوەڕ ڕۆژی قیامەتە , لەو ڕۆژەدا هەموو تاوانەکان بچووك و گەورە لای خودا وەك میمۆریەك تۆمارکراون بێ ئەوەی هیچی فەرامۆش و پشتگوێ بکرێن .

هەرچی تاوانی دژ بە مرۆڤەكانن ئەوە لە دادگای خودا لە دنیادا وەك دام و دەزگایەكی پڕ دادگەری جێ بە جێ دەكرێت .

## خوێندنەوەی دی فەرموودەی پەرتەوازەیی :-

## هەژموونی مێژوو و غیابی هەژموونی دەق

یەكەم كتێب دەربارەی مێژووی حوكمڕانی كاربەدەستانی ئیسلامی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ٣ و ٤ی كۆچی بە تایبەتی كتێبی تەبەری ٢٢٤-٣١٠ی كۆچی ناسراو بە (مێژووی نەتەوە و پاشاكان )یان مێژووی تەبەری. ئەوە واتای ئەوە نییە , كە پێش تەبەری مێژوونووسی ئیسلامی نەبووە , بەڵكو هەر لە سەدەی دووەمی كۆچییەوە كۆمەڵە مێژوونووسێك لە دەفەرەكە هەبوون , بەلاّم مێژووەكەی تەبەری لە نێو كورددا ناسراوترە لە ئەوانی تر . لە لایەكی دی وەك مهنای شرۆڤەكار و كۆمێنتكار لە لاپەڕە ١١ و ١٢ دا دەڵێت : " لەو بەشەی تایبەت بە ئیسلامەوە ئەوا ڕووداوەكانی ئەوسای سالّ دوای سالّ هەتا سالّی ٣٠٢ی كۆچی ڕیز كردووە .... ئەم جۆرە میتۆدە هەتا لە ئەوروپاش باو بوو , ئەوەتە (بوكلی) مێژوونووسی ئینگلیزی دەڵێت : باس كردنی ڕووداوەكان بە پێی سالّەكان هەتا سالّی ١٥٩٧ میلادی ئەوروپا پێی ئاشنا نەبوو ."

ئەم جۆرە نووسینە , بێ لە غەربیلدان و تاوتوێكردن و شرۆڤەكردن , دنیایەك لە زانیاری ڕاست و ناڕاست بلاّودەبێتەوە . سەبارەت بە ئێمەی

موسڵمانەوە دەبوو ئەو زانیاریانە ستاندەر و پێوەرێکیان هەبووایە , چۆن پێوەر و ستاندەر بۆ فەرموودە لە فەرموودەناسی هەیە.

## سەرچاوەکانی تەبەری بۆ نووسینی مێژووی تەبەری

کتێبەکەی تەبەری لە سەر " گێڕانەوەی ڕووداوەکان " دامەزراوە , نەك شەن و کەو کردنی ڕووداوەکان . لێرەدا لەو سێ سەدەی دوای وەفاتی خۆشەویست , کەلتووری کۆن و نوێ دەوری خۆی بینیوە لە ڕووداوەکاندا . مەهنا لە ل١٠-١١ دا ژێدەری ڕووداوەکانمان بەمشێوەیە لە لای تەبەری بۆ ڕیز دەکات , لەوانە :

١. لە مێژووی پەیامبەرەکاندا , کتێبەکەی لە سەر تەفسیر و سیرە دامەزراندووە ...,
٢. لە مێژووی ئێراندا , کتێبە فارسیەکان بە عەرەبی ,
٣. لەمێژووی ڕۆم , نەصارەکانی شام ...,
٤. مێژووی جوولەکە , هەندێ سەرچاوەی ئیسرائیلی ,
٥. هەروەها چەند ڕووداوێکی ئیسلامی لە هەندێ سەرچاوە وەرگرتووە ....

پرۆسەی (گێڕانەوە لە مێژوودا) , بە تایبەتی مێژووی ئیسلامی هەتا دەرکەوتنی ئیبن خەلدون ئامادەگی هەبووە . خراپترین سیمای مێژووی تەبەری ئەوەیە قورئانی نەکردۆتە ستاندەرێك بۆ ڕاستی و نا ڕاستی ڕووداوەکانی ( ئیسلامی ).

بە پێی ئەو کتێبانەی بە دەست ئێمەی موسڵمان گەیشتووە بێجگە لە بوخاری و موسلیم چوار گێڕانەوەی ئەبو داود ٢٠٢-٢٧٥ و ترمزی ٢٠٩-

٢٧٩ و ئیبن ماجە٢٠٩-٢٧٢ هەروەها نەسائی ٢١٥-٢٠٣ . لەو چوار گێڕانەوەدا مێژوو , کەلتووری عەرەبی سێبەری لە سەر دەقی هەندێ فەرموودەدا کردووە , بۆیە بەهای ئەو چوارە لەگەڵ بوخاری و موسلیم جودایە . لێرەدا فەرموودەی لاواز و هەڵبەستراو بەدەرکەوت , کە ئەسیجی عەقڵی کاربەدەستی دەوڵەت و مفتی ڕەسمی دەوڵەتە .

لەم بەشەدا ئاماژە بە چوار شت دەکەین کە سێبەریان لە سەر تێکستی قورئان دروست کردووە و بوونەتە دین :

١. فەرموودەی پەرتەوازەیی
٢. وەفاتی پێغەمبەر
٣. فەتحی وڵاتان بە تایبەتی کوردستان
٤. شوناس

## یەکەم / فەرموودەی پەرتەوازەیی

حاکم مەتیری و سەید حەسەن سەقاف دوو لێکۆڵینەوەی جیاوازیان لە سەر فەرموودەی پەرتەوازەیی کردووە . تێکستی فەرموودەکە بە زۆر شێوە هاتووە , لەوانە گێڕانەوەی عەوفی کوڕی مالیك : " جوو بوونە ٧١ گروە , تەنیا یەکی بۆ بەهەشتە ئەوانی تر بۆ ئاگر ,نەصارا بوونە ٧٢ گروە , تەنیا یەکی بۆ بەهەشتە ئەوانی تر بۆ ئاگر , ئومەتەکەم دەبنە ٧٣ گروە , تەنیا گروهی جەماعەت ئامێز بۆ بەهەشتن , ئەوانی تر بۆ دۆزەخ ."

مەتیری پێی وایە ئەم فەرموودەیە ( سەنەد ) لاوازە هەروەها لە گێڕانەوەکاندا ( زیادە ) و ( کەمی ) تێدایە , بۆیە نابێتە فەرموودەیەکی

ئاحاد . هەرچی سەید سەقافە باوەڕی وایە فەرموودەکە ( سەنەد ) و (مەتن )ی لاوازە هەروەها پارادۆکسی لەگەڵ گوتاری تێکستی قورئان پێکدەهێنێت .

هەڵوەشاندنەوەی فەرموودەکە لە مەتن و زیادەکان دایە ! چۆن ؟ قورئان دەڵێت : " ئێوە باشترین ئومەتن لە نێو خەڵکەکان ." کەچی فەرموودەکە بانگاشەی ئەوە دەکات , کە ( ئومەتی موسلمان خراپترین ئومەتن , چونکە ٧٣ گروە خراپترە لە ٧٢ی نەصارا هەروەها لە ٧١ی جولەکە !!!" لەو پارادۆکسیەدا , موسڵمان زوو دەرك بەوە دەكات كە ئەو فەرموودەیە زادەی دەسەڵاتی عەرەبییە , نەك زادەی قورئان , چونكە تێكست و گوتاری قورئان وەك دەقێكی ئەرگومێنتكار و ستاندەر ئەو فەرموودەیە هەڵدەوەشێنتەوە.

ئەم فەرموودەیە هەندێ جار دەكرێتە ستاندەر و پاساو بۆ گومان دروستكردن لە سەر ڕەوتی ئیسلامی لە جیهانی ئیسلامیدا . ئەو درودۆنگ و ڕاڕایە تەواو لە نێو ڕەشۆكی مێگەلی ڕەنگیداوەتەوە و گوتاری ئیسلامی كەرت كەرت كردووە . هەر ئەوانەش دەتوانن حوكم لە سەر چارەنووسی نەتەوە بكەن . ئەو بیركردنەوەیە لە كۆمەڵگا هەژموونێكی مەزن بە ئیسلامی میللی دەدات , كەچی گومان لە بەرامبەر ( زۆریی ) تەیاراتی ئیسلامی دروست دەكات.

## دووەم / وەفاتی پێغەمبەر

قورئان وا باسی ئەنصار و مهاجرین دەکات , مرۆ تەمەنا دەکات لەوان بووایە . لە شوێنێکدا قورئان دەڵێت : " ئەنصاریەکان لە خۆیان دەگرتەوە بۆ مهاجیرەکان " هەروەها لە سیرە هاتووە کە ئەنصارەکان دەستبەرداری زۆر شت بوون بۆ مهاجیرەکان هەتا ( ژنی دووەمیان )! ئەو پەیوەندیەی ئەنصار و مهاجرین مرۆ سەرسام دەکات , تەحسین حەمە غەریب ناهەقی نەبوو مەدینەی ئەوسا بە پێغەمبەرستان ناوببات . سەیدی ڕەحمەتیش ئەو (ئەوە قورئانیە) بە ئەوەی قورئانی ناوببات . جگە لە پەیوەندی نێوانیان , هەردوولا پەیوەندیان لەگەڵ خودا زۆر گەورەتر بوو , ئەوەتە قورئان , وەك شاهێدێکی ئیلاهی دەربارەیان دەڵێت : " ئەوان لە خودا ڕازی بوون , خوداش لەوان ڕازی بوو "ئەو پەیوەندیە دایەلێکتیکیەی نێوان ئەنصار و مهاجرین , ئەنصار –مهاجرین لەگەڵ پێغەمبەر , ئەنصار – مهاجرین لەگەڵ خوا و بەپێچەوانەوەش , تەواو چیرۆکی گێڕانەوەی وەفاتی پێغەمبەر هەڵدەوەشێننەوە .

ئەلمبارکفوری لە لاپەڕە ٥٥٩ی گولاوی سەرمۆردا دەنووسێت : " دوای وەفاتی پێغەمبەر –سەلامی خودای لێبێت –پێش ئەوەی ( کفن ) و (دفنی) بکەن لە مەسەلەی ( جێنیشدا ) جیاوازی دروست بوو , لە (سقیفە)ی (بەنی ساعدە )دا چەندین گفتوگۆو قسەو باس بەرپابوو لە نێوان کۆچکەران و ئەنصاردا . لە کۆتاییدا ڕێککەوتن لە سەر جێنشینایەتی ئەبوبەکر , ئەمە تا کۆتایی رۆژی دووشەممە بەردەوام بوو تا شەو داهات و ناگایان لە ئەسپەردەکردنی تەرمی پێغەمبەر نەما , تا کۆتایی شەوی سێ شەممە لەگەڵ سپێدەدا , جەستەی پیرۆزی پێغەمبەر لە سەر جێگەکەی خۆی بوو ..." ئەم گێڕانەوەی مێژووە تەواو ئەو هەموو ئەدگارەی قورئان

و سیرە هەڵدەوەشێنێتەوە , ئەمە دەبێت؟! گێڕانـەوەی مێـژوو و فـەرموودە نـاتوانن بـە هـیچ کلوجێـك تێکسـتی قورئـان ڕەتبکەنـەوە , چـونکە وەك عەبدالرەحمان صەدیق گوتـەنی قورئـان ستاندەری مێـژوو و فەرموودەیـە , نەك بە پێچەوانەوە ."

## سێیەم / فەتحی وڵاتان بە تایبەتی کوردستان

باسکردنی پرۆسەی ( فەتح ) پرسێکی ترە کە تەواو لەیەك جودان لە نێوان قورئان و مێژوودا . زۆربەی مێژووی ئیسلامی لە لایەن تاکی عەرەب نووسراوەتەوە , بە دەگمەن هەڵدەکەوێ کەسانی وەك ( صەلاح شارەزووری) و (ئیبن خەلەکان )...دەستیان هەبووبێ لە نووسینەوەی فەتح کردنی کوردستاندا . مەلا سەلیم حەوێزی باسی فەتح کردنی کوردستانی لە ڕوانگەی مێژوو و میزاژ کردووە و بە هیچ جۆرێك بە لای پێوەری قورئانی دانەچووە .

پرۆسەی فەتح بە پێی پێوەری قورئان هەر فەتحکردنی وڵاتان نییە , بەڵکو کردنەوەی دڵەکانیشە . یەکەم فەتح , فەتحکردنی مەککەی زێدی پێغەمبەر و ناوەندی دەسەڵاتی بتپەرستی عەرەب بوو .پاش هەشت ساڵ ئاوارەبوون , پێغەمبەر بە دەسەڵاتێکی عەسکەری مەزن هاتەوە مەککە و مەککەی لە بت پاککردەوە . قورئان لە سورەتی فەتح دا دەفەرموێ : " کە سەرکەوتنی خودا هات و مەککە فەتح کرا , خەڵك دەستە دەستە موسڵمان بوون ...." هند و وەحشی کە بکوژی هەمزە بوون , هەردووك موسڵمانبوون , بۆیە هیچیان پێ نەگوترا , کەواتە قسە و هەڵوێستی پێغەمبەر نەك دڵی تەنیا هند و وەحشی کردەوە , بەڵکو خەڵك لە مەککە و دەوروبەریشی موسڵمان بوون .

هەردوو هێزی جیهانی ئەوسا دوو هێزی ستەمکار بوون , بۆیە خەڵکی دەرەوەی دەسەڵاتی ساسانی و ڕۆمی چاوەڕێی ڕزگارکارێك بوون . خەڵکی وەك ( ئیستراگۆن ) و ( فلادمیر ) و (لەکی ) بوون , چاوەڕێ بوون ( گۆدۆ )

یەکی کۆنکریتی بوون, نەك گومانـاوی هەتا کورد و کوردستان لە داگیرکەری ساسانی و ڕۆمی فەتح بکات و بندەستەکان لە ستەمی دینەکان دەربهێنن .

نوسەری کتێبی ( امجاد الاکراد ) باس لەوە دەکات کە هێزێکی کوردی هاریکاری لەشکری ئیسلامی کردووە لە فەتحکردنی کوردستانی ساسانیدا ." بۆ نا ؟ ولآتی کوردان لە دوای کودەتای کۆرش-هارپاك لە ٥٤٩ پێش میلادەوە هەتا ١٦ای کۆچی ٦٤١ میلادی نزیکەی هەزار و دوو سەد ساڵ لە ژێر دەستی ئەخمینی - ساسانی بوو.

هێزی عەلمانی ئەو گەڕانەوەی کوردی پێ هەزم ناکرێ , بۆیە کاکەیی -یارسان و ئێزیدی و زەردەشتی وەك کۆمەڵەی ئەتنیکی -ئایینی بچووك و داخراو لێی جیاکردەوە هەروەها لە سەرەتای سەدەی بیستەم بە پاڵپشتی سەعید سنەیی و حوزنی موکریانی پێستێکیان بلآوکردەوە , کە لەشکری ئیسلام بە شمشێر هاتۆتە کوردستان , بەلآم نووسەرانی وەك د.عزەدین مستەفا و د.جەمال نەبەز و نەوشێروان مستەفا ... ئەو بانگەشەیان بە درۆخستەوە ...

ڕاستە ڕزگارکردنی هەردوو بەشی کوردستان , کردنەوەی دڵی کوردی لێکەوتەوە , بۆیە ئەوە ١٤٢٠ساڵە زیاتر لە سەدا نۆوەتی کورد لە سەر ئەم دینە ماوەتەوە .

لە لایەکی دی هەندێ نوسەری دی ( ماڵباتی ساسانی ) بە کورد دادەنێن , با گوێیان لە ڕەئی تۆفیق وەهبی بێت " سوپای ئەردەشێری بابکان هەزاران ڕۆڵەی کوردی کوشت هەروەهاچەندانی لێ بە دیل گرتن !!!".

گوناهی خودی قورئان نییه , دەسەلاتی عەرەبی لە ژێر پەردەی زەندیق و مەوالی ....و مارکسی لە ماوەی جیاوازدا نەهامەتی بە سەر کورد هێناوە , چونکە سیرەی پێغەمبەر شایەدی ئەوە بۆ موسڵمانان دەدا , کە لە نێو سوپای ئیسلامدا کەسانێك هەن بۆ خودا دەجەنگن , کەسانێکیش هەن بۆ ئافرەت , تالان و دەستکەوتی ئابووری دەجەنگن , تەنیا ئەوانەی لە پێناو بلاوکردنەوەی دینی خودا دەجەنگن , براوەن , چونکە هەر ئەوانن دڵەکان دەکەنەوە و دەبنە هۆکاری موسڵمان بوون .

ئەوانەی هاتنە کوردستانیش زۆربە موسلمانی خوا ویست بوون , بۆیە کورد بە موسڵمانی ماوەتەوە.

## چوارەم / شوناس

زمان جیایی و نەتەوە جیایی دوو ئایەت و موعجیزەی هەبوونی خودای گەورەن . خودا خۆی لە قورئاندا ئاماژەی بەوە کردووە , کە نەتەوە جیایی و زمان جیایی ئایەتی خودان , کەچی دەسەڵاتی عەلمانی تورك و عەرەب و فارس ئەوە سەد ساڵە لە هەوڵی ئەبڕاوەن ئەو دوو ئایەتەی خودا بسڕنەوە لە ڕێگای پرۆسەی تەتریك و تەعریب و تەفریس .

قورئان مافی نەتەوەیی بە کورد دەدات کە نەتەوەیە , چونکە زمان و کەلتووری لە گەلانی هاوسێ جوودایە , زمانی ئەو وەك نەتەوەی دی کتێبی خودای پێ نووسراوە ( سەیری سورەتی ئیبراهیم بکە ) بەلام عەلمانی ئەو پێنج دەوڵەتە ئەو مافە قورئانیە بە کورد ڕەوا نابینن هەروەها عەلمانیەتی کوردیش لە دوای شۆڕشەکانی شێخ مەحموود و شێخ سەعید و سمکۆی شکاك...ئەوەندە هەست بە تەقەزم دەکەن , بۆیە بە ناوی خودموختاری و فیدرالی و لامەرکەزی و کانتۆنی کورد لە ولاتی خۆی دەکەنە برابچووکی تورك و عەرەب و فارس !!!! مەسعود عەبدلخالق ڕاست دەکات کە نەهامەتی کورد بە ئاشنابوونی بە عەلمانیەتەوە دەبەستێتەوە.

هەرچۆنێك بێ کورد لە ڕێگای ئیسلامەوە شوناسی بۆ گەڕایەوە , چونکە ماوەی ٥٤٩پێش میلاد هەتا ٦١٦ی کۆچی لە ژێر پۆستالی فارس دابوو . تۆفیق وەهبی لە کتێبی بنەچەی کوردان و بنچینەی زمانی کوردی باس لە هەڵۆیستی ئەردەشێر ( هەندێ بە کوردی دادەنێن ) بە هەزاران کوردی کوشتیە و دیل کردووە !!!

کورد , ولاتی لە دوو پارچەوە بووە یەك هەروەها لە هەمووی گرینگتر لە شوناسی هاوبەش ( فارسی +کوردی ) ڕزگاری بوو.

## زاراوەکان یا مەینەتیەکان؟

توراسی " ئیسلام "ی کە پێکهاتووە لە مێژوو و حوکمڕانی مرۆڤەکان و کەلتوور و داب و نەریتی نەتەوەکان . لەو توراسەدا چەندەها زاراوە دروست بوون , کە بە میزاژی موفتیەکان و حکومەتەکان سنووری شەرع دیاریکراوە .

لەو نێوەدا سێ زاراوە هەن , کە تەواو هەژموونـدار بوونە لە دیارکردنی ئەو سنورەدا .

لەم بەشەدا کتێبەکەمان بە شیکردنەوەی سێ زاراوەی هەژموونـدار دەست پێدەکەین , کە ئەوانیش بریتین لە :

١. .ئیسلامی
٢. خەلیفە و خیلافەت
٣. مێژووی ئیسلامی

. ئەو سێ زاراوەیە لەو زاراوەن کە هەلگری هزر و ئایدیۆلۆژیان , بۆیە زۆر مشت و مڕیان ناوەتەوە لە نێوان ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی دا , بە جۆرێك لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بەتایبەتی لەو سێ سەدەیەدا : ١٩. ٢٠ , ٢١ شەڕێکی پیرۆزیان ناوەتەوە لە دیارکردنی سنورەکاندا.

## شەڕی زاراوەکان

کۆمەڵێك زاراوە هەن , وا خەریکە لە سنووری زاراوە دەردەچن و نەك هەر چوارچێوەی چەمکی وەردەگرن , بەڵکو لە نێو بکەرە جیاوازەکانی گۆڕەپانی کوردی , ئەدگاری موقەدەس وەردەگرن.

ئەم زارەوانە بە هۆی چەندین هۆکارەوە بوونەتە مولکی مرۆی موسڵمان , لەوانە :

## یەکەم / زاراوەی " ئیسلامی "

وشەی ( ئیسلام ) ناوی دوای دینی ئیلاهی –ئاسمانییە کە خودا پێی ڕازی بی بۆ مرۆڤایەتی . کەواتە ئیسلام میتۆد و پەیامی کۆتایی مێژوویی کەلامی ئیلاهیە بۆ مرۆڤ . ئیسلام تەواو بە پێچەوانەی پێشبینی فۆکۆیامایە , ئەو دروشمی " کۆتایی مێژوویی " لە هەمبەر هەرەسی کۆتایی مێژوویی کۆمۆنیست بەرز کردەوە . لەمەدا دەفامرێتەوە کە کۆتایی مێژوویی لە پلاتفۆرم و ئەجێندای مرۆڤ نییە , دوێنی حوکمڕانی کۆمۆنیستی لە سۆڤیەت پاش زیاتر لە حەفتا ساڵی حوکمڕانی , کە ببووە قیبلەی کۆمۆنیستی هەموو دنیا , ئەو حوکمڕانیە و ئەفسانەیە هەرەسی هێنا لە ناوەوە , نەك دەرەوە . کۆتایی مێژوویی فۆکۆیاماش هەر بە دەردی حوکمڕانی کۆمۆنیستی دەچێت .

کۆتایی مێژوویی هەر لە حوکمڕانی قورئاندایە , نەك مێژووی ئیسلامی . ئەو دووە تەواو تێکەڵ یەك بووینە , هەتا ستەم و ناسیۆنالیزم وایکردووە کاربەدەستانی موسڵمان دووەم پێش یەکەم بخەن , بۆیە مێژووی

موسـڵمانان بوومتـه مێـژووی کاربەدەسـتانی ( ئیسـلامی ) , نـەك دۆزی موسڵمانەکان .

لەو مێژووەدا بە تایبەتی مێژووی سەدەی نۆزدەدا چەند زاراوەیەك لە هەگبەی کاربەدەستان و ڕۆناکبیرانی موسڵمان دروست بوو .

گەر بمانەوێ , زاراوەی " ئیسلامی " لە ئەدەبیاتی موسڵماناندا شرۆڤە بکەین , دەبێ دوو چاوگی بنـەڕەتی قورئـان و سـیرە ( قورئـانی کردارەکی )بکەینـە پێـوەر بـۆ ئـەوەی قسـە لـە سـەر هـەبوون و نـەبوون یـا حـزوور و غائیبی زاراوەکە بکەین . ئـەوەی لـە قورئانـدا هەیـە , ئیسلامـە وەك دیـن و پەیڕەوێك نەك ئیسلامی . خودا لە سوڕەتی ال عمران لـەو بارەیـەوە دەڵێت :" ان الدين عند الله هو الاسلام " ئەو بنەما سەرەکیەکەی شوناس لای خودا بۆ ڕۆژی قیامەتە , نەك دنیا , چونکە لە دنیادا پێوەری " لا اکراه في الـدين " کاری پێـدەکرێت , خـودا منـەتباری هـیچ تاکێـك نییـە موسـلمان بیـت یـا غـەیرە موسـلمان , ئەمـە تـەواو لـە قورئـان ڕوون کراوەتـەوە . خـودا لـە سوڕەتی کەهفیشدا , مرۆی ئازاد کردووە لە دنیا چ شوناسێك بۆ خۆی بڕیار دەدات... کەواتە خودی ئیسلامی لە قورئاندا نییە , ئەوەی هەیـە ئیسلامـە , کە مـرۆی ناچارنەکردووە بـە منـەت ئینتیمـای بـۆ هـەبێت , چـونکە تـەنیا پرانسیپەکانی ئیسلامە لە قیامەتدا دەبنە پێوەر , جا تـۆ بـە خـۆت لـە دنیـا ئازادی چ هزر و دینێك دەکەیتـە پـەیڕەو ... , سـەرفیرازی قیامـەت , تـەنیا ئەوەیە مرۆ بڵێ لا اله الا الله و پەیڕەوی بکات ئازاد و سەرفیراز دەبێ!

**زاراوەی " ئیسلامی " لە قورئان و سیرەتدا بوونی نییە .**

پاش ئەوەی حوکمڕانی عەلمانی باڵی بە سەر زۆربەی ڕۆژهەڵاتی ناوین داگرت ...کورد وەك نەتەوە گەورەترین زەرەری کرد بە گۆڕینی حوکم لە خیلافەتەوە بۆ عەلمانی . مەسعود عەبدولخالق دەڵێ عەلمانیەت مەینەتی بۆ کورد هێنا , " چونکە وڵاتی بۆ پێنج بەش دابەشکرا .

لە پاش دامەزراندنی ئیخوان موسلمین لە مصر لە ١٩٢٨ , زاراوەی ئیسلامی بووە بەدیلی حوکمڕانی عەلمانی . لەوساوە ئەم زاراوە حزووری هەیە لە نێو زۆر وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ناوین و ئەوروپی و هەتا ئیسرائیل!

ئەم زاراوە لە نێو حوکمڕانی ڕاشدین و ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی بوونی نەبوو , بەڵکو زاراوەی موسلمان هەبوو تا لە ئەهلی زمە ( جوو , مەسیحی , زەردەشتی...) جیابکرێنەوە.

کەواتە زاراوەی ئیسلامی بە دوو واتا و مەدلولی جیاواز بە کاردێت : لە دیدی عەلمانی بە واتای موسڵمانی خاوەن پەیامی سیاسی و حیزبی دێت . هەرچەندە مەرج نییە باباى ئیسلامی هیچ پەیوەندی بە ڕێکخستنی حیزبی ئیسلامی هەبێت ! لە دیدی حیزبی ئیسلامی , جیاکردنەوەی دیندارەکانە لە دام و دەزگای ئەزهەر و ئەوقاف و تەکیە و خانەقا. ئەو واتایەش تەواو لە جێی خۆی نییە . لەمەدا دەفامرێتەوە شوناسی ئیسلامی لە پێناسەی عەلمانی و حیزبی ئیسلامی هێشتا تارمایی لە سەرە . دوور و نزیك قورئان لەمەدا بەرپرسیار نییە , بەڵکو ئەوە مێژوو و سەردەمە هەم زاراوەکەی دروست کردووە , هەم تارمایی و لێڵی خستۆتە سەر !

## دووەم / زاراوەی خیلافەت , نەك خەلافەت

خیلافەت وەك دام و دەزگایەکی حوکمڕانی , لە قورئان و سیرە بوونی نییە , تەنیا ئایەتی ٢٦ سورەتی( ص )نەبێ دەربارەی حوکمداری داود پێغەمبەر هاتووە (یا داود انا جعلناك خلیفە فی الارج فأحکم بین الناس بالحق-ئەی داود ئێمە تۆمان کردۆتە جێنشین لەم مەملەکەتە , فەرمانڕەوایی لە نێو خەڵکاندا بە حەق و ڕاستی ئەنجام بدە –هەقی هەموو لایەك بدە) . شەریعەتی داود و سلێمان دوو دەزگای حوکمرانی ئیلاهی بوون , چونکە هەردوو هەر پێغەمبەر نەبوون , بەڵکو حوکمڕانیش بوون . شەریعەتی پێغەمبەرەکانی تر , جگە لە شەریعەتی خۆشەویست , لە دەرەوەی دەسەڵات بوون .

حوکمڕانی پێغەمبەرەکان بۆ پیادەکردنی پرۆگرامی خواناسی لە هەر ٢٥ پێغەمبەری قورئاندا , تەنیا حوکمڕانی داود و سلێمان و موحەمەد پێغەمبەر هەبووە . لە کتێبی پیرۆزدا , تەوراتی جوولەکە و ئینجیلی نەصرانیدا , هێندە بە بێزەوەری باسی کەسایەتی داود و سلێمان کراوە , بەر لەوەی پێچەوانەی بەریبوونی ئەو دوو زاتە بێت , تەواو پێچەوانەی عەقڵگەرایی ڕۆژئاوایە : ئەوان ئەوە ( دوو ژن ) بۆ پیاوێك بە زۆر و ستەم دەزانن , کەچی لە سەر دینێکن کە بڕیاری ١٠٠٠ ژن بۆ سلێمان پێغەمبەر داوە؟؟!!!!!!!!!!

حوکمڕانیەکەی پێغەمبەریش تەنیا ١١ساڵ بووە , ٢٢ پێغەمبەرەکەی تر هەموو چەوساوەی حوکمی نەمرود و قارون و فیرعەون...بوون .

حوکمڕانی خەلیفایەتی لە دەوڵەتدا تەنیا پێنج خەلیفەی ڕاشیدین خەلیفەی پێغەمبەر بوون , نەك خودا.

ئەو خەلیفەیەی لە سوڕەتی بەقەرەدا ئاماژەی پێکراوە , مەبەست لێی خەلیفەی حوکمڕانی نییە , بەڵکو وەك جێنشینی مرۆ لە سەر زەوی دێ . فریشتە و جنۆکە گومانیان لە سەر ئەو بڕیارەی خودا هەبوو , بەس خودا ئەو مشت و مڕ و گومانی پێش وەختی فریشتە دەبڕێنێتەوە , بە قەولی : خودا دەزانێ , ئێوە نایزانن .

لە لایەکی دی هەر پێغەمبەر ئاماژەی بە هیچ جۆرێکی حوکمڕانی نەکردووە , دادوەری بنەمای دەوڵەتی مەدینە , دەوڵەتی پێغەمبەر بوو . ئەو دەوڵەتە لە سەر دوو پایەی پراکتیکی دامەزرا بوو , ئەویش قورئان و سیرە بوو ...ئەو دەوڵەتە بەڕاستی دەوڵەتی هاولاتی بوو ...جێی جوو و دیان و بێ دینی تیا دەبۆوە , ئەو جۆرە دەوڵەتە زۆربەی قیپتیەکانی مصری هاندا , واز لە دینی خۆیان بێنن و ببنە موسڵمان .

کەواتە خیلافەت لە دیدی قورئاندا موئەسەسەیەکی حوکمڕانیە , ئامانج لێی بەرپاکردنی حوکمی خودا و دادوەری کۆمەلأیەتیە , نەك سەربڕی و حوکمی سەدەکانی ناوەڕاستی کڵێسا و سەپاندنی پەڕگیریەکی دینی .

کەواتە زاراوەی خیلافەت لە پاش مەرگی پێغەمبەر وەدەرکەوت , تەنیا چوار –پێنج خەلیفەکەی یەکەم خەلیفەی پێغەمبەر بوون , نەك خەلیفەی خودا لە سەر زەوی .

## سێ یەم/ زاراوەی مێژووی ئیسلامی

زاراوەی " مێــژووی ئیســلامی " زاراوەیــەکی نوێیــە , بەرهــەمی هــزری ئیسلامیە , نەك ئیسلام . نووسەرە کۆنە موسلمانەکان وەك واقدی , تەبەری , ئـیبن نەسـیر , ئـیبن خەلـدوون... هـیچ کامێکیـان پاشـگری ئیسـلامی بـۆ مێژووەکەیان زیاد ناکەن , بۆ نموونە کتێبەکەی تەبـەری , کـە ( ٩ ) بەرگـە ناوی " تأريخ الامم و الملوك " , کتێبەکـەی ئـیبن نەسـیر , کـە ( ١١ ) بەرگـە, ناوی " الكامل في التأريخ " بوو هەروەها کتێبەکەی ئیبن خەلدوون , کە (٨) بەرگە , ناوی " تأريخ يان المقدمه " بوو .

لە سەدەی بیستەمدا , چەندەها کتێب بە پاشگری ئیسلامی دەرکەوتن , لەوانە :

١. ئەکبەر شاه نەجیبادی لە ساڵی ١٩٢٢ بە زمانی ئۆردو کتێبێکی نووسی بە ناوی The History of Islam–مێژووی ئیسلام لە سێ بەرگدا , ئەم کتێبە لە ساڵی ٢٠٠٠ بە ئینگلیزی بلاّوکرایتەوە.
٢. مەحمود شاکر کتێبێکی لە ( ١١ )بەرگدا بـە نـاوی التـأريخ الاسـلامی بلاّوکردەوە.
٣. دکتۆر عەلی صەلابی لە ساڵی ١٩٩١ کتێبێکـی بـەناوی التـأريخ الأسـلامی لە دوو بەرگدا بلاّوکردەوە.

بە ڕای من نە عەلمانی لـە ڕۆژهـەلاّتی ناوینـدا , عـەلمانی ڕۆژئاوایـە کـە قەبووڵی ڕا و دەنگی نەویتر بکات , هەتا زامنی دادوەریـی بـێ لـە دام ودەزگا ڕەسمیەکانــدا . لــە ژێــر سـایەی عەلمانیــەتی ڕۆژهەلاّتــدا بــە دەگمــەن

هەڵدەکەوێت دام و دەزگایەکی حکومی بوونی هەبێت , بۆیە هەموو دەسەڵاتەکان لێرەدا تێکەڵ یەك دەکرێن .

زۆربەی ئەم جۆرە ڕژێمانە بەرهەمی دیگۆل و سەدامن , کە هەردوو لە دوو ماوەی جیاوازدا دەیانگووت : " من حکومەتم , حکومەت منم " " لە دوای من تۆفان " یان بەعس گوتەنی :" هەرکە صەدام قسەی کرد , عێراق قسەی کردووە "

لە هەناوی ئەم ڕژێمە دکتاتۆرانەدا , چەندین تەیاری " ئیسلامی " دروست بوون , هەندێکیان دەسکردی ڕژێمەکان بوون وەك دەزگای ئەزهەر , وەزارەتی ئەوقاف , تەکیە و خانەقا ...دژ بەو تەیارە , لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی بیستەم دا لە باشووری کوردستان تەیارێکی ڕیفۆرمیستی گۆڕانخواز دروست بوو . لە هەناوی ئەو تەیارەش دەرك بە ئامادەگی کەلتوور و تێگەیشتنی عەرەبی بۆ ئیسلام دەکرێت .

لە ناو ئەو گەرەلاوژەیەدا پێکۆڵ بۆ شوناس هەوڵێکی ئەزۆك و دژوار دەبێت , بۆیە وەك کورد لە باشووری کوردستان دا , باوەڕم وایە دەست گرتن بە بنەماکانی قورئان و سیرە لە ژیانی کردەگی مەدینە دا , خۆشترین ژیان بۆ کەسی موسڵمان و غەیرە موسڵمان دابین دەکات.

ئەو هەموو ( قەیرانەی ) لە باشووری کوردستان هەیە , کامەیان دەرهاوێشتەی ئیسلامن ؟ دکتۆر فوئاد ڕەشید لە سیمینارێکی بەشی کوردی کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی زانکۆی سەلاحەدین دا پێداگیری لە سەر ئەوە دەکات , کە هیچ قەیرانێکی باشوور , زادەی خودی ئیسلام نین " ع .باپیر لە دیداری ڕووداو ( شەوی ٦-٧ی نیسانی ٢٠١٥ بە ڕاشکاوی وتی : هەموو هەڵس و کەوتی موسڵمان لە سەر ئاشتی دامەزراوە وەك سەلامی کەسی و

سەلامی ناو نوێژ... جا ئەوەی ئەو ئاشتیە ببەزێنێت موسڵمان یان غەیرە موسڵمان بێت , ستەمکارە ."

## ئیشکالیەت لە مێژووی ئیسلامیدا

لە پاش مەرگی موحەمەد پێغەمبەرد ﷺ , هەندێ دوالیزم لە هزری ئیسلامی دروست بوون , کە کاریگەریان زۆر لە سەر ڕەوتی ڕووداو و بیرکردنەوە و حوکمڕانی ئیسلامی هەبوو , لەوانە :

## گێڕانەوە و ڕاڤەی مێژوویی

کۆمەڵگا و قۆناغی کۆمەڵایەتی ڕاڤەی جیا هەڵدەگرن , بۆ نموونە کۆمەڵگای خێڵەکی و سەرمایەداری بە یەك پێوەر شرۆڤە ناکرێن . توێژەری کوردی سیکیولەر یا لانیك هەردەم بە چاوی ماددەی مێژوویی دەڕواننە مێژوو . ئیکرام کەریم ٢٠٠٧,ل٨ لە ل٤٧٤ مەوسوعەی سیاسی کەیالی دەگوازێتەوە " کە تەفسیری ماددی بریتییە لە توخمی بنەڕەت و پاڵنەر لە ئاکاری مرۆڤدا بە درێژایی مێژوو بریتییە لە بەرژەوەندی ئابووری . " فوئاد مەجید میسری یەکێ لەوانەیە , کە " وا مێژوو دەبینی کە بێجگە لە ململانێی چینایەتی شتێکی تر نییە" ئەو خوێندنەوەیە مێژوویێکی کۆنی هەیە لە نێو متەنەوەری کورد . مەسعود موحەمەدی بیرمەند باوەڕی وایە کە ئەدگاری فیودالی ئینگلیزی لە فیودالی کوردی جیاوازە , لەوەش زیاتر هەتا جۆری ئەدەبەکانیش ( کلاسیکی , فۆلکلۆری ) لە یەك جیان . جەمال نەبەز لە ل١١ی کتێبی

(کاژیک) ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە "مەسعودنوێنەری چینی دەرەبەگ و ئاخاکان بوو , منی بە کۆمۆنیست دەدایە قەڵەم ."

مێژوو کردەیەکی مرۆڤە , ڕاست و هەڵە هەڵدەگرێت , بۆیە هیچ مێژووەك لەو دوو ئەدگارە بەدەر نییە .ئیکرام کەریم ٢٠٠٧, لە ل١٤ لەو بارەیەوە دەنووسێت: " ڕاستە و نکولی لەوە ناکرێت مێژووی ئیسلامیش وەك مێژووی هەموو میللەتێکی تر خاڵی ڕەشی تێدایە , بەڵام بێویژدانییە تەنها تیشك بخرێتە سەر ئەو خاڵانە و خاڵە گەشەکانی بکرێت بە ژێر لێوەوە."

کەواتە مێژوو بەشێك نییە لە گوتاری قورئانی , بەڵکو پێوەری قورئانی پێوەرە بۆ لە بێژینگدانی گێڕانەوەی ڕووداوی مێژووی ئیسلامی .

لە لایەکی دی ئەوەی هەیە مێژووی کاربەدەستانی ئیسلامین , نەك مێژووی گەلانی ئیسلامی وەك لە ناونیشانی کتێبەکەی تەبەری دەردەکەوێت . ئەو جۆرە مێژووە نەك لە هەر ئەوروپا بوونی هەبووە , تەواو ئەدەبەکەشی گرتبۆوە وەك ئەدەبی چاخە جیاکانی ئەوروپا , لەوانە شیعرەکانی جیفری چۆسەر لە سەدەی چواردە و پازدە , زۆربەی دراماکانی شەکسپیر لە سەدەی شازدە و حەڤدە , ڕۆمانەکانی دانیال دیفۆ لە سەدەی هەژدە...هتد

لەو هەموو خوێندنەوەیەدا : ئایینی , ئابووری-ماددی , سێکسی , چیانەیەتی , ماڵباتی...وێنای لایەکی ژیان دەکەن هەروەها قسە لە سەر چینێك , توێژێك , ئاینێك دەکەن , نەك هەموو .

له لایەکی دیش ڕووداوی هەناوی مێژوو , مەرج نییە ڕەنگدانەوەی تێکستی قورئان بێت , کەواته بۆ ئەوەی قورئان لەو مەسەلەیەدا حاکم بێ , دەبێ گێڕانەوەی ڕووداوی مێژوو بە پێوەری قورئان شرۆڤە بکرێت , تاکو جارێکی دی پێغەمبەرستانێکی دی له کۆمەڵگا دابمزرێت , که شوێنی هەموو هاوڵاتیەکانی دەڤەرەکەی تێدا دەبێتەوە .

## پرسەکانی مێژووی ئیسلامی

پێغەمبەر لە یازدە ساڵدا , دەوڵەتێکی هاوڵاتی دروست کرد . پاش گەیینی ئەو پەیامە له ژیانی کردارەکیدا , خودا پەیامی کەلامی بە ( الیوم اکملت دینکم ...) کۆتایی پێهێنا . دوای نەمانی جەستەیی خۆشەویست , چەند پرسێك بە هەژموونی هەندێ زاراوە لە کۆمەڵگای کاربەدەستانی ئیسلامی دروست بوون , کەواته لێك جیاکردنەوەی زاراوەکان بۆ دیارکردنی سنوورەکانە .

سێ جۆری زاراوە هەن : زاراوەی شەرعیی , کەلتووریی, زەمانەوانیی . هەر یەك لەو سێ یانە سنووری خۆیان دیارە , بەڵام کاربەدەستان تێکەڵی یەکیان کردووە . حەسەن المالکی ٢٠١٤ له ل٢٢-٢٣ی کتێبی الصحبە و الصحابە ئاوا لە یەکی جیاکردۆنەتەوە : " شەرع دەسەڵاتی بە سەر کەلتوور و زەمان دا هەییە , هەرچی کەلتوورە تەنیا دەسەڵاتی بە سەر زەماندا هەیە , بەڵام زەمان دەسەڵاتی بە سەر شەرع و کەلتووردا نییە , تەنیا هەقیقەت و مەجاز له خۆی دەگرێت ." له پرسی صەحبە و صەحابە ئەو سێ زاراوانە تەواو تێکەڵکراون :

## ١. زاراوەی صەحابە و صوحبەت

ئەو شەش سەد ساڵەی نێوان بوخاری ( ٢٥٦ی کۆچی ) و ئیبن حەجەر عەسقەلانی (٨٥٢ ی کۆچی ) دەربارەی صەحابە , تەنیا چەند نووسراوێکی چاپکراو هەن . حەسەن مالکی ٢٠١٤ لە ل٨-٩ دەربارەی ئەو کتێبانە دەنووسێت : " کتێبە ناسراوەکانی ئەو بوارە بریتین لە (وەرگرتن...ئیبن عەبدلبر) و ( شێری دارستان...ئیبن ئەسیر ) , (پێکان ...ئیبن حەجەر ) و ( هاوەڵناسی... ئەبی نەعیم ) و ( موعجمی صەحابە...ئیبن قانع ...لەو هەمووە تەنیا سێیەکەی یەکەم چاپکراون ."

تێکەلأوکردنی هەردوو زاراوەی صەحابە و صوحبەت لە نێوان هەر سێ زاراوەی شەرعی و کەلتووری و زمانەوانیدا , تارمایەکی لە سەر هەردوو وشەکە دروستکردووە .

ئەو چەند پێناسە و فەرموودەیە ئاماژە بە هەبوونی جیاوازی زاراوەکان دەکەن , لەوانە :

١. هەر کەسێ پێغەمبەری بینی بی یا پێی گەیشت بێت .
٢. ئەوەی بە موسلمانی بە پێغەمبەر گەیشت بێ وە لە سەر ئیسلام بمرێ.

لەو دوو پێناسەدا ( هەمزە ) و ( وەحشی ) لە لایەك و ( ئەبوبەکر صەدیق ) و ( معاویە )... وەك یەك دەخوێندرێنەوە هەروەها سەبارەت بە پێناسەی یەکەم ئەبو بەکر و ئەبو جەهل دەخاتە ژێر یەك چەتر , چونکە هەردووك لەگەڵ پێغەمبەر ژیاون هەروەها خزمەتیان لە رێگای زەواجەوە هەبووە .

ئەو فەرموودە و وتەی خوارەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە جیاوازی لە نێوان هەردوو زاراوەی صەحابە و صوحبەت هەیە :

١. تا نەڵێن پێغەمبەر یارانی ( هاوەڵانی ) خۆی دەکوژێت .

٢. لە نێو هاوەڵەکانم دوازدە دووڕوو هەن .

٣. ئەی پێغەمبەر : پیاوی چاك و خراپ لێیان دەپرسێ , بۆیە پێویستە پەردەیەك هەبێت .

کەواتە بە پێی ئەو فەرموودانە و وتەی ئیمام عومەر جیاوازی لە نێوان دوو زاراوەکە هەبێت .

لە ل٢٠ ی مونجید دەربارەی صوحبەت هاتووە : " لە گەڵیدا بوو و هاودەمیی و هاوڕێیەتیکرد و لێیجیانەبووەوە ." کەچی لە ل٥٥٦ ی فەرهەنگی سەرچاوە دەربارەی وشەی صوحبەت هاتووە : " هاوڕێیەتی , دۆستایەتی ."

ئەو هاوڕێیەتی و هاودەمیی و دۆستایەتییە , تێکەڵکردنی هەر سێ بونیادەکەیە, شەرعی , کەلتووریی , زمانەوانیی .

حەسەن مالکی لە ل٣١-٣٨ شرۆڤەی زاراوەی صوحبەت لە سەر بنیاتی زمان و کەلتوور و شەرع دەکات.

## صوحبەت لە ڕووی زمانەوە

چەمكی صوحبەت لە سەر ئاست دەبیندرێت , فراوانەكەی بریتییە لە :

١. هاوبەشی كردن لە ئەدگارێك یا حاڵەتێك بە باشی و خراپی.

كەواتە كەدەڵێین : فلان یاوەری فلانی كرد . بە واتای هاوڕێیەتی كرد- تێكەڵی كرد هەروەها دەبێ ئەو هاوەڵییە درێژ بێت , نەك كورت , چونكە كورتبوونی یاوەریەكە بە پێی عادەت بە واتای صوحبەت نایەت .

٢. لە ڕووی زمانەوە دەكرێ یاوەریەكە كورت بێ یا هەر نەبێ یا قورئان وتەنی دژ بێت وەك " و ما صاحبكم بمجنون –التكویر : ٢٢ "

٣. یاوەری مردوو كردن : بە دوو تەرمی خدر كەوت

٤. خاوەن : اصحاب السفینە ..., اصحاب الرس ...

كەواتە وشەی صوحبەت وشەیەكی بێلایەنە , چونكە لایەنی چاكی و خراپی لە خۆ دەگرێت . لە ڕوانگەی زمانەوە عەبدڵلا بن ابی و ئەبو سفیان و ئەبو جەهل و ئەبو بكر یاوەر و هاودەمی پێغەمبەر بوونە! كەواتە لە ڕوو زمانەوە صەحابە بەشێكە لە صوحبەت .

## چەمكی صوحبەت لە كەلتوور

چەمكی صوحبەت لە كەلتوور بریتییە لەوەی مرۆڤ پێی ئاشنا بووە , وەك دەبینین ئەو دیتنە كەلتوورییە زۆر تەسكترە لە واتای زمانەوانیی وشەكە .

كەلتوور یا عورف لە مەزاهیبەكاندا , پێوەرێكی ناچارییە , كەواتە عورفی موعتەبەر بریتییە لەو عورفەی لەگەڵ دەق –تێكست ( قورئان )

دەسازێت , نەك بە ڕووی هەڵشاخێت . لە ڕوانگەی عورفەوە بەس نییە مرۆڤێك پێغەمبەر بینی بێ , بەڵکو ماوەیەکی زۆر یاوەری و تێکەڵی لەگەڵ کرد بێت , گەر وانەبێت , ئەوا لە دەرەوەی عورفە .

ئەم واتایەی صوحبەت جودایە لە واتای زمانەوانی .

## چەمکی صوحبەت لە شەرع

زۆربەی مەزهەبەکانی سوننە هەردوو ئەدگاری بیستن و بینینی پێغەمبەر ناکەنە مەرجی یەکلاکەرەوەی زاراوەی صوحبەت لە شەرعدا .نوێگەر و فەقیهەکان لە سەر پێناسەی صوحبەت ڕێکنەکەوتوون , هەتا هەر دوو ئەدگاری بیستن و بینینی پێغەمبەریش بە پێناسەی جامع و مانع نەزانن .

مالکی لە ل٣٩دا دەڵێت: من لە قورئان و فەرموودە و ئاساری صەحابە و تابعین بەوە گەیشتووم " صوحبەت لە شەرع دا تایبەتە بە موهاجرین و ئەنصار ..."

مونجید لە ل ٢١ دەربارەی وشەی صەحابە دەبێژێت : " یارەکانی- هاوڕێکانی پێغەمبەر کە دیویانە و ماوەیەکی باش لە خزمەتیدا بوون و لەگەڵیدا بوون ."

لە ل٥٥٦ دەربارەی وشەی صەحابە هاتووە : " یارانی پەیام بەر , هاوەڵانی پێغەمبەر." وەك وشە بە واتای صەحابەی پێغەمبەر لە قورئان نەهاتووە , بەڵکو وەك ئەنصار و مهاجرین و سابقین ناویان هاتووە .

لەو هەمووە گرینگە مرۆ خۆی لە کەلتووری مەزهەبی ( سوننە و شیعەی سیاسی ) ڕزگار بکات , چونکە بە پێی مەزهەبی سوننی کۆمەڵگەی صەحابی کۆمەڵگەیەکی فریشتە ئاسا بووە , لە ڕوانگەی شیعەوە کۆمەڵگەی صەحابە کۆمەڵگەیەکی شەریرە . جا بۆ ڕزگاربوون لەو ناوانە خۆ بەستنەوەیە بە گوتاری ئایەتەکانی ( ئەی ئیمانداراني خاوەن قەول و فعل) یاوەرە دڵسۆزەکانی پێغەمبەر .

کورتەی قسان ئەوەیە , ئەوە صەحابە ئەو کەسەیە کە تەسلیمی ئایەتەکانی قورئان بووە , نەك ئەوانەی عومەر و عوسمان و عەلی یان تیرۆر کرد یا سیستەمی دەوڵەتیان گۆڕی لە خیلافەت بۆ پاشایەتی , هەتا خیلافەت , مونجیدی کوردی , ل ٦٩٥ ,بگێڕنەوە بۆ خولفەت ( خەوش , ل٦٩٩ , خەلافەت-گەمژایەتی و حەماقەت و گێلی , ئیکرام ل٧ . لە هەمووش گرینگتر صەحابە لە ڕووی شەرعەوە وەردەگرین نەك زمان و عورف , چونکە هەر ئەو صەحابەیە (هاوەڵ ) لە ئەمڕۆ و بەیانیدا بەرەو چەمکی (برای پێغەمبەر ) دەچێت .صەحابە و ئال لە ڕووی شەرعەوە ئەو کەسانەن بۆ ئیسلام دەتاوێنەوە , نەك گەورە پیاوان ئیسلام وەك عومەر و عوسمان و عەلی و حوسێن و عومەر عەبدولعەزیز...تیرۆر دەکەن.

## ٢. عەقڵی ئامێر و عەقڵی ئالتەرناتیڤ

لە زۆر شوێنی قورئانـدا , هەنـدێ پـرس تایبـەت کـراون بـە کەسـانی (یتفکـرون , یعقلـون , اولوالبـاب , یتفقهـون...) . بـوونی ئـەو دیـاردە قوتابخانەی ( عەقڵی ) و ( نەقلی ) دروست کردووە .

لە قورئانـدا , عـەقڵ حـزوری نییـە , بـەڵکو بەرهـەمی عـەقڵ ئامـادەگی هەیە . عەقڵ خۆی کیانێکە قابیلی تێکشکاندنە , هەروەکو سروش و عـەلی عوسمـان جـەختی لـە سـەر دەکەنـەوە , بـەلام عەقڵانیـەتی نێـو قورئـان بـۆ دەربازبوون بوونی هەیە , نەك تێکشکاندن!

لە قورئانـدا عەقڵانیـەت , بـە واتـای بـە گەڕخستنی عـەقڵ دێـت , ئـەو عەقڵە هـەردەم ئاکتیڤـە و کلیلی کردنـەوەی گـرێ کوێرەکـانی کۆمەڵگایـە . ئەو عەقڵەی لە دەرەوەی قورئان بوونی هەیە , عەقڵێکی عەقڵگەراییـە , لـە دایك بـووی عەصرێکی تەنویریـە و خـۆی بـە بـە بـەدیلی تێکستی ئیلاهـی دادەنێت.

لەمـەدا دەفامرێتـەوە , نـەك زەوتکـردن و دەستبەسـەرگرتنی عـەقڵ لـە قورئان نییە , بەڵکو عەقڵانیەتی ئیسلامی کردنـەوەی گـرێ کوێرەکـان پـێ سپێردراوە , چونکە خودا دەیەوێت مرۆڤ مـرۆڤ بێـت , نـەك لـە مرۆڤبـوون ڕابماڵدرێت.

کەچـی عـەقڵی ئەلتـەرناتیڤی یـا سـروش ٢٠١١ , ل٦١ گوتـەنی :"عـەقڵی ئەریسـتۆیی , عــەقڵی دیکـارتی , عــەقڵی کـانتی , عــەقڵی هیگڵـی... هتـد ئاوێنـەی عـەقڵیان وەهـا شـکاندووە و کـەرتی کـەرتیان کـردووە کـە هـیچ وێنەیەکی ساغی تێدا نابینرێت."

عەقلگەرایی بزاڤێکە لە نامۆبوون و خود دابەشکردن و ناهاوسەنگی لە نێوان بوونی مرۆڤ و توانای مرۆڤ هەروەها ئەو مرۆڤە خۆی لێ ون دەبێت , هیرمان هیسە وتەنی وەك هیرکلیتس ڕۆمانی دەمیان-١٩١٩ لە خۆی دەگەڕێت , عەلی ٢٠٠٩ ,ل١٢.

ئەو عەقلگەرایانە لە موسڵمان و غەیرە موسڵمان بە دوای ئایەتی متشابهات دەکەون , چونکە لە پرسی ( یەقین ) و ( عەین یەقین ) لە ڕەوشی لەرزۆك دەژین , بە ڕەشەبا و باهۆزێك لە ڕەگەوە کۆتایان پێدێت.

گەورەترین مەرگەسات لە پرسی مێژوو لە عەقلآنیەت و عەقلگەرایی دروست بوو . عەبدلکەریم سروش ٢٠١١ , ل٣٧-٣٨ باوەڕی وایە کە هەردوو قوتابخانەی ئەشعەری وموعتەزیلە دوو قوتابخانەی گەورەی داهێنانی زانستی کەلام بوون . زانستی کەلام ناساندنی سیرە بوو بە شێوەی عەقلآنیەت و عەقلگەرایی ..." ئەصڵ لە دیندا چەسپاندنی ئیمانە لە ناخی ئینساندا , هەروەها ڕەنگدانەوەی ئەو ئیمانەیە لە کۆمەڵگادا هەتا مرۆڤەکان لە ئاشتی و تەبایی بژین , نەك گێڕانەوە و ساخکردنەوە. غەزالی و ئیبن ڕوشد وەك دوو قوتبی هەردوو جەمسەری عەقڵانیەت و عەقلگەرایی لە شەڕێکی کەلامی دابوون . ئیبن ڕوشد بە حوکمی کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی تەواو عەقلگەرا بوو , هەرچی غەزالیە هێندە دژی فەلسەفە و عەقلگەرایی بوو , کتێبێکی دانا بە نێوی ( تهافت الفلاسفە ). سروش,ل٢٨ لە غەزالی دەگوازێتەوە , کە ئەو خۆ خەریککردنە بە عەقلگەرایی ڕەنج بە خەسارییە , چونکە زانستی کەلام , کە زۆر موعتەزیلەکان لە دەوری دەسوڕێنەوە باوەڕی کەس زیاد ناکات.

لە لایەکی دی هەردوو زاراوەکە هیچ پەیوەندی بە " پێشەڤەچوون " و " پاشڤەچوون " وە نییە . یازدە ساڵی حوکمڕانی پێغەمبەر لە سەر حوکمڕانی وەحی-عەقلانیەت دامەزرا بوو . ئەو حوکمڕانیە پێغەمبەرستانی لە مەدینە و مەککە دروست کردبوو هەروەها دەوڵەتەکەی پێغەمبەر دەوڵەتێکی مەدەنی و هاولاتی ئامێز بوو , هەتا پێغەمبەری مەزن لە سەرە مەرگیشدا قەرزاری جولەکەیەکی هاوسێی بوو . لە قسەی سروش ٢٠١١,ل٤٢ دەفامرێتەوە کە بەرەی عەقلانیەت لە ماوەی وەفاتی پێغەمبەر هەتا دەرکەوتنی موعتەزیلە حوکمڕانیەکی ئەزموونخوازی بوون , هەرچی موعتەزیلە بوون خەریکی گوتاری عەقلی بوون." بابا سوهەیل قاشا ٢٠١٥ , ل ١٠٥-١٢٨باس لەوە دەکات کە موعتەزیلەکان لە نێو خۆیاندا هەرزوو بوو بوونە دوو بەرە : بەرەی بەسرا , بەرەی بەغدا."

ئەو یازدە ساڵەی حوکمڕانی پێغەمبەر _١-١١ کۆچی هەروەها سی ساڵەی حوکمڕانی ڕاشدین ١١-٤٠ی کۆچی پێشڤەچوونێکی ئەوعی بوو لە بیرکردنەوەی مرۆی عەرەبی نێو کۆمەلگای بتپەرستی عەرەبی. ئەو گۆڕانکارییە هزری و ئایدیۆلۆژی و عەقیدەییە تەواو جودایە لەگەڵ ئەزموونی رۆژئاوا , چونکە لەوێ زەوتکاری و ستەمکاری هەبوو , بۆیە رزگاربوون لە کەنیسە ئازادی بوو. سروش لە ل٦١ لە ریچارد رورتی دەگوازێتەوە کە خوداپەرستی لە رۆژئاوا بەستراوەتەوە بە پاشڤەچوون و پێشڤەچوونەوە : " لە سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست خوا , خوا بوو , دووایی لە سەردەمی رۆشنبیری و مۆدرنیزم عەقڵ بووە خوا , ئێستاش لە سەردەمی پۆست مۆدێرنیزم هیچ خوایەك بوونی نییە ." زەوتکاریی و ستەمکاریی , بەدیلێکی ناوەندێکی هزری ناکامڵی لە ئەوروپا دروست کرد ,

عەقلگەراكان وەك ستەمكارەكانی كەنیسە , ستەمیان گواستەوە بۆ زات-خود , چونكە مەنزلَی خوایان بۆ عەقلّ دابەزاند , دوایێ ئەو عەقلّەشیان بەرەڵلآ كرد .

ئـەو مێـژووە خوێنـاوی و سـتەمكاری و زەبـر بـە دەسـتیە ...چـەندەها كەسی وەك ( مامون )ی دروست كرد , كە دەستی لە زانا و هەتا بـرای خـۆی نەپاراست .

گەواتـە مێـژوو نابێتـە سەرچـاوەیەك لـە ناسـاندنی سـیرە و شارسـتانی ئیسلامی , چونكە هەلگری هەردوو ئەدگاری باش و خراپە , بۆیە مێژوو لە ڕوانگەی قورئان تەداولی ئەو باش و خراپەیە لـە نێـوان خەڵكەكان , نـەك سەرچاوەیەك بۆ دادگاكردنی داتاكانی قورئانی پیرۆز .

## كۆتایی بەشی یەكەم

## دووبارە نووسینەوەی مێژوو بە پێوەری قورئان

دووبارە نووسینەوەی مێژوو بە پێوەری قورئانی , زۆر گێڕانەوەی مێژووی ئیسلامی دەخاتە ژێر گومانەوە . ئەوەی دەگوترێت پێغەمبەر لە سەر مەرگیش جەختی لە سەر ئەوە دەكردەوە كە فەرموودەكانی كۆنەكرێنەوە , نەكا دەقی فەرموودە تێكەڵی قورئان بێت. یا مەحمود ئەبوریە لە ل٤٧ لە گێڕانەوەی بەیهەقی دەگێڕێتەوە كە عومەری كوڕی خەتاب گوتویەتی دەمویست سوننە بنووسمەوە , بەلاّم لەوە ترسام بە دەردی نەتەوەكانی پێشوو بچن پەیڕەوی قسەكانی پێغەمبەر بكەن و قورئان واز لێبێنن , ئیمامی عەلیش هەر ئەوهای كرد بۆوەی بەو كارە قورئانێكی كردارەكی دروست نەبێت."

ئایەتی : " گوێ ڕایەڵی خودا و گوێ ڕایەڵی پێغەمبەر بكەن ..." واتای دوالیزم لە حوكم نایەت , بەڵكو بۆ قسەكردنە لە سەر درێژەی بابەتەكە وەك نوێژ , زەكات , حەج ... بە گوێرەی ئەم ئایەتە , قورئان دەستورە و فەرموودە یاسا , بەلاّم هەردووك لە سروشی خودا دروست بوونە , نەك ئارەزووی پێغەمبەر .

لەوانەیە ئەو نەهیەی پێغەمبەر لە نووسینەوەی فەرموودە , ترسی پێغەمبەر بێت لە ئومەتەكەی كە قورئان و فەرموودە تێكەڵ یەك بكەن , ئەگەرنا بۆ بوخاری و موسلم و ئەوانیتر نووسیویانەوە , خۆ ئەوانیش وەك عومەر و عەلی موسڵمان بوون ؟؟!! لێرەدا بەندە لەگەڵ ڕای مەحموود ئەبو

ریە ٥٢-٥٣ نییە , کە پێغەمبەر وازی لە نیوەی وەحی ( فەرموودە)کانی هێنا بێت؟؟

سێکوچکەی قورئان و سیرە و فەرموودە دین دەگەیەنن , نەك مێژوو , هەربۆیە بوخاری و موسلم و ئەوانیدی ڕاستی فەرموودەیان بە پێوەری قورئان و سیرە بینی , عەبدلرەحمان صەدیقیش قورئان بە ستاندەر دەزانێت بۆ لە بێژینگدانی فەرموودە .

نووسینەوەی مێژوو بە پێوەری قورئان و ئەزموونی حوکمڕانی سیرە , خۆ ڕزگارکردنە لە تارمایی مێژوو . کە ماوەیەکی زۆر لە حوکمڕانی ئەمەوی و عەباسی گرت بۆوە , هەندێك لەو خەلیفانە موعتەزیلە بوون , بە جۆرێك موعتەزیلە بوون درزی لە ماڵباتەکان کردبوو : مەنصور موعتەزیلە بوو , مەهدی کوڕی دژی بوو , ئەمین دژە ئیعتیزال بوو , کەچی مامونی برای موعتەزیلەیەکی توند بوو .

# بەشی دووەم

## مێژوو لە نێوان گێڕانەوە و ئاراستەکردندا

مێژووی( ئیسلامی ) لە ( واقدی ) و ( تەبەری ) و ( ئیبن ئەسیر ) و ( ئیبن کەسیر )...هەتا دەرکەوتنی ( ئیبن خەلدون ) مێژوویێکی گێڕانەوەییە , نەك شرۆڤەکاری . چۆن ( دی سۆسێر ) ئاراستەی دیراساتی زمانەوانی لە ( فیقهی زمانەوانی بەراورد ) بۆ ( زمانەوانی —زانستی زمان ) بە هەمان شێوەش ( ئیبن خەلدون ) ئاراستەی مێژووی گۆڕی لە ( گێڕانەوە ) بۆ ( شرۆڤەکاری ).

دینداری و پەرستشکاریی پانتایەکی هەرە مەزن لە مێژووی نەتەوەکان داگیردەکات , دەتوانین بێژین پەرستکاریی بەستراوەتەوە بە هەبوونی مرۆڤەوە . هاجانی , ل١٩٧ لە پلوتارك , مێژوونووسی یۆنانی دەگوازێتەوە , کە وتوویەتی : " لە هەناوی مێژوودا شاری بێ قەلاّم بینی , شاری بێ قوتابخانەم بینی , شاری بێ کۆشکم بینی , بەلاّم شاری بێ پەرستگام نەبینی ."

گێڕانەوە لە مێژووی ( ئیسلامی)دا کەلێنێکی گەورەی لە مەعریفە و متمانەی مەعریفەی مێژوویی دروست کرد . شۆرش و شارستانی ئیسلامی لە هەناوی نیمچە دورگەی عەرەبیدا , ڕوو بە ڕوو دوو فاکتەری هەژێن بۆوە :

یەکەم , تا نزیکەی دوو سەدەوە هەر لە سینگ مایەوە,

دووەم , مێژوونووسی وەك تەبەری ئەوەی بینی بووی و بیست بووی گواستیەوە ناو هەگبەی مێژووەکەیەوە , هەروەها وەك لە بەرگی یەکەم

دەردەكـــەوێ مێژووەكـــەی پـــڕە لـــە زانیـــاری زەردەشـــتی و مـــانی و مەزدەكی...دەربارەی ئێران , ژێدەری ئیسرائیلی بۆ جوولەناسی , هەروەها ژێدەری ڕۆمی دەربارەی ڕۆمناسی .

ئەو دوو فاكتەرە , شانی موسڵمانەكانی قورستر كردووە , نەك سووكتر دەركـەوتنی بوخـاری بەشـێك لـەو دوو فاكتـەرەی لاواز كـرد , بـە پێچـەوانەی عومـەر و عـەلی ...فـەرموودەكانی پێغەمبـەری نـەك هـەر كۆكردەوە , بەڵكو ساخكردەوە , بۆیە لێرەدا فەرموودەی لاواز و هەڵبەستراو دەركەوتن كە زادەی كاربەدەستانی ناوچەكەن .

هەرچـەندە هـەردوو بـرا ویكـرام , وەرگێڕانـی جـەرجیس فتحاللـە , كوردستان بە لانكەی مرۆڤایەتی دادەنێن.

ئەو پەرستشاكاریەی كوردستان هەتا هەشتاكانی سەدەی بیستەم , لـە ژێـر كاریگـەری مێـژووی ئیسلام دابـوون , نـەك خـودی قورئـان خـۆی . لـە لایەكی دی , كۆمەڵگای كوردی كۆمەڵگایەكی چەنـدڕەگیـە . ئـەو هەجینیـە بووەتـە كـەلتوورێك , كـە هـەژموونێكی ڕۆحـی و عەمـەلی لـە سـەر بیركردنەوەی تاكی كوردی هەیە.

ئەم دیراسەیە جەخت لە سەر ئیسلامـی ویراسی و كەلتووریی , نەك ئێزیدی , كاكەیی ,...دەكات .

### بەر لە ساڵی هەشتای شوناسی ئیسلام لە باشوور

١. چاك یا مەرقەد
٢. نووشتە
٣. شێخ و سەید
٤. تایبەتبوونی ئیسلام بە تەنیا پەرستش

## گەڕان بە دوای شوناس دا

لە سەر بەشی پێشوودا قسەمان لە سەر ئەوەکرد , کە زاراوەی " ئیسلامی " یا " ئیسلامی سیاسی " دوو داهێنراوی نوێی عەلمانی دەڤەرەکەن . پلەیتۆ-ئەفلاتۆن وەختی خۆی ڕاستی دەگووت , کە دەیگووت لە پەنا هەر پەیڤێك هزرێك هەیە " ئەمڕۆ دەرکەوتووە کە لە پەنا هەر پەیڤێك مەدلولێك هەیە .

پەیڤی " ئیسلامی " لای عەلمانی کورد " منتەمی حیزبی ئیسلامی " دەگەیەنێت , وەك لە بەشی دواتر ئاماژە بەوە دەکەین , کە " مرۆی ئیسلامی " ناو حیزبی عەلمانی شوناسی " ئیسلامی " لای حیزبەکە و کۆمەلگای کوردی لێ دەسێنرێتەوە. لە لایەکی دی دەمانەوێ بێژین , پەیڤی " ئیسلامی سیاسی " سەد لە سەد دەرهاوێشتەی هێزی عەلمانیە لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلأت . عەلمانی کوردیش , چ حیزب , چ ڕۆشنبیر لەو دوو چاوگەوە وشەکەی وەرگرتووە. لێرەدا , دەپرسین ئەم داتاشینە دروستە؟؟ گروهی عەلمانی و لایسیزم " ئیسلام بە پێوەری مەسیحی دەبینی ." پاش شۆرشی فەرەنسی , زەمانی پاشا گوێ و کلکی بۆ کرا هەروەها کۆمەلگا لە دەستی قەشەکان دەرهێنرا , مەسیحیەت بووە دینی دوور لە سیاسەت , لە کەنیسەدا زیندانی کرا و دەوری لە کۆمەلگا مەحروم کرا ." بە پێچەوانەوە ئیسلام لە دەسەلأت بێ یا لە دەسەلأت کرابێ , پرەنسیپی حوکمڕانی هەیە , هەر چوار دەسەلأتی ڕاشدین و ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی , کە زیاتر لە ١٣٠٠ حوکمی زۆربەی موسڵمانەکانیان کردووە هەتا ١٩٠٨ , باشترین نموونەیە , بۆیە مەسیحیەتی ئەمڕۆ سینۆنیمی ئیسلام نییە . زاراوەی ئیسلامی سیاسی وەك دکتۆرێك دەڵێت :" گاڵتەجارییە , لەگەڵ گیانی

ئیسلام ناگونجێت . لەو ڕوانگەوە دەبێ ئیسلامی ڕیازی , ئیسلامی .... هەبێت ".

بابای ناو حیزبی " ئیسلامی " هەر تەنیا زاراوەی یەکەم بەکاردەهێنێت , نەك هی دووەم . بۆچی حیزبی ئیسلامی , زاراوەی " ئیسلامی " دەکاتە پاشکۆی حیزبەکەی و تاکە مونتەمیەکانی ؟ خۆم گومانم لەوە نییە , کە ڕۆناکبیر و ئەندام مەکتەب سیاسیەکان لە بەندە شارەزاترن لە ئیسلام , بۆیە دەزانن زاراوەی ئیسلامی داهێنراوە , ئەم زاراوەیان تەنیا وەك شوناسی جیاکەرەوە بە کار دەبەن .

لە لایەکی دیەوە , دوور نییە ئەم زاراوەی زادەی ئیسلامی عەرەبی ( ولآتی عەرەبی ) بێت . لە ناو کلتووری عەرەبیدا , هەندێ شت پەڕیونەتەوە ناو بزافی ئیسلامی و حسێبی ئیسلامیان بۆ کراوە ! ئەو حەرەکە ئیسلامیەی ولآتی عەرەبی تەمەنی نزیکەی سەدەیەکە , بەلآم بێ ئەنجامی کۆنکریتییە , کەچی تەیاری ئیسلامی لە تورکیا لە ماوەیەکی زۆر کەمتر توانی دیواری کۆنکریتی و ئایدیۆلۆژی و شورابەندی عەسکەری بڕێت و گەورەترین قەلآی عەلمانی لە دەفەرەکە بهەژێنێت و هەر سێ پۆستە سەرۆکایەتیەکەی دەوڵەت بباتەوە ....ناوی حیزبەکەشی پاشکۆی ئیسلامی بەسەرەوە ەنییە!!

ئەوەی خەمە ئەوەیە , ئێمەی کورد لە باکوور لە ماوەی ١٩٢٤ەوە تا ٢٠٠١ تووشی گەورەترین هەڵمەتی سڕینەوەی شوناسی نەتنیکی و نەتەوەیی بووینەوە لە دەست عەلمانی کەمالی تورکی , کەچی حیزبی کوردی مارکسی خەباتێکی بێ وچان و سەرسەخت دژی ئەو دەسەلآتەی ٢٠٠١-٢٠١٥ دەکەن , وەك بڵێی ئەوان بەرپرسی ٨٠ ساڵی داگیرکردنن !!

گومـــان لـــەوە دانیـــە , کـــە ســـەپاندنی ئـــەلفبێی لاتـــینی بەرهـــەمی عەلمانیەتی غەرب و مستەفا کەماله , حیزبی عەلمانی کوردی سەرسـەختانە داکۆکی لـەو پـرۆژە کۆلۆنیالیـە دەکـەن , چۆن حیزبـی مارکسـی کـوردی لـە باشووری کوردستان سەرسەختانە بەرگری لـە سـایکس –بیکـۆ دەکـەن , بـێ ئەوەی هەست بکەن!! , پاش ئەوەی ئەردۆگان وەك ئامـاژە داوای گێڕانـەوەی ئەلفبێی عوسمانی کرد , حیزبی کوردی لـە بـاکوور سەرسـەختانە دژی ئـەو پـرۆژە وەســتانەوە , وەك بلّێــی کــورد زۆر قــازانجی لــە ئــەلفبێی لاتــینی کردبێت!!

## خورافات... پەرستشی کۆن

بیار کانافاجیو ۱۹۹۳ کتێبێکی بە ناوی معجم الخرافات و المعتقدات الشعبیە فی أوروبا بلاوکردەوە , ئەحمەد تەبالیش ئەو کتێبەی تەرجومەی عەرەبی کرد . لە کتێبی دەروازەیەك بەرەو ڕۆژئاواناسی دا ئەو ئیتقاتە ڕۆژئاواییانەم لەگەڵ ئەوانی خۆمانم بەراورد کرد , بۆم دەرکەوت جیاوازیەکی ئەوتۆ لە نێوان هەردووکان نییە! لێرەدا تەنیا مەبەستم ئەوەیە هەبووە خورافیات لە کەلتووری هەر نەتەوەیەك نامۆ نییە.

هیچ نەتەوەیەك نییە لە ماوەیەکی مێژوویدا , خورافە بەشێك لە مێژووی نەبوو بێت . کوردیش یەکێك لەو نەتەوانەیە , کە هەر لە سەردەمی کۆنەوە لە نێو خورافە و ئەفسانە ژیاوە . ڕەشاد میران لە کتێبی ڕەوشی ئاینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا , ئاماژە بەوە دەکات کە کورد لە سەردەمی گوندی چەرمۆوە بتی پەرستووە . ئەو هەموو ئاینەی لە کوردستان هەبوونە وەك زەردەشتی , جولەکایەتی , مەسیحیەت هەتا ئیسلام لایەنە کەلتووریەکەی لەگەڵ لایەنە ئاسمانیەکەی پەیڕەو کردووە .

سێ جۆری ئیسلام لە کوردستان هەن : ئیسلامی میللی , ئیسلامی دەوڵەتی , ئیسلامی حیزبی ئیسلامی , دەیڤید ماکدوێل لە ل۳۱دا دەربارەی ئیسلامی میللی دەنووسێت:" جودایی ئایینی کوردەکان لە تەریقەتە سۆفییەکان و کارە سەیرەکانیان واتە حاڵ لێ هاتن و شەتەحات و ئاگر خواردن و لە خۆدان و شتی تریشدا دەردەکەوێ . "

دکتۆر عەبدوڵلا غەفور ۲۰۰۰لە ل٤٥ دەنووسێت : " لە سەرژمێری گشتی ساڵی ۱۹۸۷ دا , ڕێژەی ئیسلام بە ۹۳٪ کۆی دانیشتوان دەخەملێندرێ.

ئەم ڕێژەیە لە هەموو سەرناوچەکان وەك یەك نیە بۆ نموونە هەولێر دەگاتە ٩٨٪ سلێمانی و کەرکوك ٩٢٪ و لەدهۆك ٨٦٪..."

فیلیپ کرینبروك لە ل١٣٩ی کتێبی کولتوور و ناسنامەی کورد دەنووسێت ئێستا زۆربەی کوردان موسڵمانی سوننەی شافعین هەروەها لە ل١٤٠ بانگەشەیەکی شافیعییەکان دەگوازێتەوە کە ئەوانەی کە شافیعی نین , ناتوانن کورد بن .

سۆفیگەریی و قادریی دوو دیاردەی ئایینین کە تەواو جودان لە تێگەیشتنی حیزبی ئیسلامی کوردی . هەر کرینبروك لە ل١٤٤دا ئاماژە بەوە دەکات : "هەرچەندە کۆمەڵێك شوێنەواری تەریقەتی نەقشەبەندی لە سەدەی ١٧ بەم لاوە لە کوردستان بە جێ ماوە , بەڵام پێگەی بەرچاوی ئەم تەریقەتە لە کوردستان زۆرتر بە بۆنەی کاریزمای پیاوێك بە ناوی مەولانا خالید١٧٧٨-١٨٢٦ ئەم تەریقەتە ڕەگی لە کوردستان بە تایبەتی سلێمانی داگرت."

لە لایەکی دی گروپێکی دی هەن بە ناوی قادریی , کە بێخودترەکانی ئەم گروپە بە دەروێش ناسراون . ئەم دوو تەریقەتە لەگەڵ یەك کۆك نیین , هەر ئەوەش وەیکردووە پەرتەوازییەك لە نێو ئیسلامی میللی دروست ببێت . زۆربەی ڕابەرانی ئەو دوو تەریقەتە لە شۆرشی کوردی بەشدار بن , کەواتە ئەو بەشداریەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری , شێخ مەحموودی بەرزنجی , شێخ سەعیدی پیران بەشداریەکی مەزهەبی ئیسلامی میللی بوو , نەك ئیسلامی ( سیاسی).

دەرکەوتنی ئەو دوو تەریقەتە لە مەزهەبی سوننی لە شۆرشی کوردیدا , بەر لەوەی ڕووبەڕوو ببێتەوە لەگەڵ داگیرکەران , ئەوا لە لایەن باڵی عەلمانی چەپی کوردی ڕوو بە ڕوو بۆتەوە .

ململانێی هەردووماڵباتی شەمزینی ( دینی سەیدی ) لەگەڵ ماڵباتی سیکیولەری بەدرخانییەکان لە باکوور هەتا ئینشقاقی ١٩٦٤-١٩٦٦ و ناشبەتاڵکردنی ١٩٧٥ لە باشوور درێژەی هەبوو .

لە نێو ئەو دوو تەریقەتە دیاردەی شەتەحاتی سۆفیگەری و لە خۆدان و ئاگر خواردن ...هەیە . هەندێك لەو دیاردانە مانەوەی ڕەگی دین و دینزای کۆنە لە کوردستاندا هەروەها ئەو دیاردانە تایبەت تەنها بە کوردەوە .

چستاف شتلبەر لە سەردەمی خورافە باس لە هەژموونی خورافە بەر لە سەردەمی ئایدیۆلۆژیا و مەعریفە لە ڕۆژئاوا دەکات هەروەها دکتۆر عەبدالواحید وافی باسی هەندێ داب و نەریتی سەیر کردووە لە ڕۆژئاوا و جیهانی عەرەبی ...ئەوانە پێماندەڵێن کە نەفسانە و خورافە و نووشتە و فالگرتنەوە ...تایبەت نین بە نەتەوەیەکەوە , بەڵکو هەموو نەتەوەکان بەشدارن لەو دیاردانە . یەکێ لەو خرافانە لە ئەورووپاش هەیە , ئەویش مانگ گیران و ڕۆژ گیرانە . بیار کانافاجیۆ لە ل٢٥٢ بەمجۆرە باس لە مانگ گیران لە ئەورووپا دەکات :" مانگ گیران شوومێکی ئاشکرایە , مرۆ دەتوانی خۆی لەو شەرە بپارێزێ بەوەی حەوت تیر بە ئاراستەی باوێت!" لە حەفتاکانیش بە چاوی خۆم بینی چەکداری کورد بە سەر بان دەکەوتن گوللەیان بە ئاراستەی مانگ دەهاوێشت یا تەنەکەیان دەکوتی هەتا مانگ دەبۆوە!!

## مەرقەد - چاك

بیار کانافاجیو لە ل١٨ و١٩ پیاوچاکێك-ژن چاکێك لە صەقلیە دەکات کە لە چواری شوبات باسی لە جەژنی لە دایکبوونی ناگاسیٚ دەکات بە بیانووی دەرکردنی شەیتانەکانی شار... بە واتای هەبوونی مەرقەد و پیاوچاکی لە کەلتووری ئەوروپاش هەبووە .

کوردستان بە تایبەتی باشووری کوردستان پانتایەکی فراوانی هەیە لە مەرقەدی پیاوچاکانی ئیسلام . مەلا ڕەئوف سەلیم حویزی ١٩٧٠ لە کتێبی کوردستان و ئاینی ئیسلام باس لە هەبوونی گۆڕی چەند سەحابەیەکی ناودار لە کوردستان دەکات , لەوانە فەزڵی کوڕی عەباس و ئیبن عومەر و زوبێری کوڕی عەوام....بەڵام حەسەن مەحموود لە ل٢٤٥-٢٤٦ ی کوردستان لە بەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا بە زەبری سەرچاوە و بەدواداچوون ئەو تەکەهوناتە ڕەتدەکاتەوە بەوەی ئەو زاتانە هەر کوردستانیان بینی بێت .

ئەوە مانای ئەوە نییە , کە مەرقەد –چاك لە کوردستان نیین . ڕاستە مامۆستا حەسەن گۆڕی ئەبو دجانە و میقداد و ئەباعبێدە ...ڕەتکردۆتەوە , بەڵام هاتنی موسڵمانان بۆ ڕزگارکردنی کورد و کوردستان لە ساسانی و ڕۆمەکان شتێکی حاشا هەڵنەگرە , لەو شەڕانەی هەردوو هێز , سەحابە شەهید بوون .

جگە لە هەبوونی گۆڕی سەحابە لە کوردستان وەك گۆڕی ئەصحابە غازی لە کورانی عەنکاوە , ئەوا لە کوردستان چەندان گۆڕی کۆنتری تێدایە لەوانە گۆڕی عوزێر پێغەمبەر لە هەولێر, ئەو گۆڕەش وەك گۆڕی نەبی یونس لە موصل هەڵبەستراوە . ئەو هەموو گۆڕە : پێغەمبەران , سەحابان ,

پیاو چاکانی وەك سولتان مزهفەر ... لەوە دەرچوون کە تەنیا گۆڕ بن , بەڵکو بوونەتە گۆڕی مراز . ئەوەتە لە کەرکوك گۆڕی بابەگوڕگوڕ بووەتە چاکی منداڵ بەخشین : " بابەگوڕگوڕ هاتم بە گوڕ بۆ کوڕ ! " , گۆڕی شێخ توراب , بۆ چابوونەوە لە نەخۆشی! , چاکی شێرە سوار بۆ چابوونەوە لە گوڕیبوونەوە!

لە هەمووی سەیرتر مەرقەد لە شەقلاوە هەیە بووتە مزارگای موسڵمان و فەلە . مەرقەدی مەم و زین  لە باکووری کوردستان بۆ بە مراز گەیشتن –هاوسەرگیری!

ئەزموونی ئەڤینی مەم و زین زۆر لێرە و لەوێ باس هەتا کردیوویەتی بە داستانی بەهانەی سیاسی ! مەجدی کامل ٢٠٠٩ لە ل ٢٤٣دا مەم و زین بە ڕۆمیو جۆلیتی کوردی دادەنێت , ڕۆمیۆ جۆلیتیش بە هێمای عەشقی کوردی ناودەبرێت . پرۆفیسۆرێکی کورد لە زانکۆی دهۆك لە خوێندنەوەیەکی سیمۆلۆژیدا وتی : ئەشقی مەم و زین –وەك دال و مەدلولی نێوان کورد و کوردستانە  , چۆن ئەوان بە یەك نەگەیشتن , کوردیش بە دەوڵەتی کوردی ناگات !!!!!!!!!!

## نووشته- شەوه

بیارکانافاجیۆ لە کتێبێکی ٣١٨ لاپەڕیدا باس لە زۆربەی داب و نەریتی پروپوچ ئامێز لە ئەوروپا دەکات , ئەو خرافاتانە لە ددان نێشە تا کاریگەری سروشت وەك با , باهۆز , تۆفان تا دیتنی زاتی خودا دەکات .

نووشتە مێژوویێکی کۆنی لە نێو کورد هەیە . تۆمابوا وەك کوردناسێکی ئاگادار لە ڕەوشی جڤاکی کورد , لە ل ١٢٩-١٣٠ ی کتێبی الکرد , دەنووسێت : کە نووشتە لە نێو کوردان چەند جۆرێکە :

١. دوورخستنەوەی چاوی پیس ( چاو ز زار )
٢. فالّ و بەخت
٣. هەلّواسینی بەرموره یان ملوانکە بۆ پاراستنی دکان لە ئازار
٤. نووشتەی عەتار , گەر ئەو نووشتەیە پارچە شیعرێکی بۆ زیادکرا , پیاوی ژندار خۆشەویستی ژنەکەی مسۆگەر دەکات ....

تۆمابوا هەموو ئەو نووشتانە بە جادوو و خورافە دەزانێت , بۆیە لە ل١٣٠ دەنووسێت : " ئەو روناکبیرانەی گوند یا شار ئەو جۆرە خرافاتانە ڕەتدەکەنەوە ."

دەرکردنی شەوە بەو نووشتانە بەشێکی تری ژیانی جڤاکی کوردن . ژنی نەخوێنەوار و لادێ نشین لە کاتی منداڵبوون , قورئانێك لە ژێر سەری ژنی زەیستانی دادەنێن بۆ دەرکردنی شەوە و رزگارکردنی منداڵەکە و ژنەکە . لە هەشتاکان بە چاوی خۆم گەنگەشەی مەلایەکی خوێنەوار و باوکێکی کۆلکە مەلا دەربارەی شەوە دیت . کوڕە مەلایەکە بە باوکی

دەگووت : ئەدی خۆ خەڵکی عەنکاوە , موسڵمان نین , قورئان لە ژێر سەری ژنی زەیستانی دانانێن ؟؟

کۆلکە مەلا و شێخی نەخوێنەوار باوەڕی بە نووشتە و شەوە هەبوو , بەڵام مەلای وەك مەلای گەورە وەك چیا لە بەردەم ئەفکاری ئەو جۆرە شێخانە بوو , بۆیە دەیوت :

سوێندت بۆ دەخۆم بەو خودای بێ چوون
بە قسەی شێخۆلکان کورد لە دین دەرچوون

..............................................

ئەی شێخی جاهیل زۆر چاك بزانە
خـودا عالـیمی سـیڕ و عـەیـانـە

لای مارتن ڤان برونەسن سێکوچکە ئاغا و شێخ و دەوڵەت بەشێك لە ژیان و بیرکردنـەوەی فیـودالی کوردیـان پێکدەهێنا . جـەلال تاڵەبانی لـە ل ٥٧ی کوردسـتان و بزوتنـەوەی نەتـەوەیی کـورد بـاوەڕی وایـە کـە سروشـتی بزوتنەوە سیاسیەکانی کورد بۆ ڕزگاربوون لـە داگیرکـەر و قۆنـاغی فیـودالی کوردی بوو هەروەها لە ل٥٩ وتەیەکی سەید عەزیزی شەمزینی دەهێنێتـەوە : " ئـەم بەشـە لـە دەربەگـە کوردەکـان و پیـاوانی ئـاییني کـە گـۆڕان بـۆ سەرمایەدارە کوردەکان ,...هەستی نەتەوەیی یان جێگای هەسـتی عەشـیرەتی گرتەوە. "

هـەتا هەشـتاکانی سـەدەی بیسـتەم ئـەم تـەرزە بیرکردنەوەیـە لـە چارەنووس و هەژمونی نووشتە و شەوە بە سەر زۆربـەی دایکـی کـورد زاڵ بوو!

# شێخ و سەید

شێخ و سەید پەیوەندیان بە خوێندەواری و مەعریفەی دینیەوە وە نییە , بەڵکو دوو مەنزڵی زیاتر ویراسین . وشەی ( شێخ )ی کوردی وەك (شێخ ) ی عەرەب نییە . لە کۆمەڵگای کوردەواری شێخولکە وەك کۆلکە مەلا وایە , دەسەڵاتی دینی خۆی لە دوو ڕێگاوە بە دەست دێنی :

١. جەهلی خەڵك

٢. دەسەڵاتی ئاغا

ئەو شێخە وەك شێخی عەرەب براگەورەی قەبیلە و عەشیرەت نییە , بەڵکو ( دەسەڵاتێکی عەباسیە لە نێو کۆمەڵگای کوردەواری) بنەماڵەی خۆی دەگەڕێنەتەوە سەر خیلافەتی عەباسی , بۆیە نووشتەکەی لە ڕوانگە مرۆی عەوامەوە زۆر کاریگەرە , کار هەتا لە جنۆکەکانیش دەکات.

لە لایەکی دی ( سەید ) دەسەڵاتێکی دی دینیە کە لە سەر مەعریفە دانەمەزراوە . سەید خۆیان بە ئەولادی رەسول دەزانن , بەڵام هەموو سیرە نووسەکان ئەگەر لە سەر ژمارەی کوڕەکانی پێغەمبەر کۆك نەبن , ئەوا لە سەر ئەوە کۆکن کە هەموو لە منداڵی مردوون , تەنیا چوار کچەکەی نەبێت . ئەو سەیدانە بە پشدێنی کەسك‌سەوز دەناسرێنەوە , هێندەی متووی شەجەرەی خێزانن هێندە متووی شەریعەت نیین , چونکە زۆربەی هەرە زۆر هیچ لە شەرع نازانن , بۆیە هەردەم لەگەڵ مەلای کوردی کۆك نیین .

بە دەگمەن ئەو سەیدانە نووشتە دەنووسن , تەنیا بەو خۆ پەیوەستکردنە ڕێزێکیان لە کۆمەڵگای کوردەواری بە دەست هێنا بوو .

هـەر سـێ , شـێخ و سـەید و دەروێـش کـە دەرهاوێشـتەی کۆلکـە خوێندەوارین بۆیە هەرگیز دانوویـان لەگـەڵ حیزبـی ئیسلامی ناگونجێت , بـەڵکو زیـاتر لەگـەڵ حیزبـی عـەلمانی دەگـونجێن , چـونکە ئـەو عەلمیانـە دەسکاری دام ودەزگای دینی ئەوان ناکات !

## تایبەتبوونی ئیسلام بە تەنیا پەرستش

شێخ و سەید و دەروێـش موریـدی گـەورەکانی خۆیـانن . ئیسلام لای ئەوان بریتییە لەو عیبادە کولتووریەی ئەوان , نەك شەریعەتی نێو قورئـان و سیرە .

## شۆرشی فەرەنسی : ریفۆرم یا شێواندن؟

گوتـاری ئیسـلام بـۆ نەتـەوەکانی دەرەوەی دوورگـەی عـەرەبی بـۆ نەهێشتنی ستەمی دینـەکان بـوو , عەبـدالرەحمان صـەدیق واتـەنی ئیسلام بەر لـە مـارکس گـوتی ئێمـە بـۆ ئـەوە هـاتووین مـرۆ لـە ستەمی دینـەکان دەربێـنین . شۆرشـی فەرەنسـی ۱۷۸۹ وەلأمدانـەوەی هـاواری دانـتی ئیتـالی و مـارتن لوسـەری ئـەلمانی بـوو . لـە کتـێبی سـەدەکانی ناوەڕاسـت تەرجومـەی برهـان قـانع هـاتووە : " ڕاسـتە شۆرشـی فەرەنسـی دام ودەزگـای لویسـی شازدەهەم و ماری ئەنتوانێتی کۆتایی پێهێنا , سەرکردە چەپەکانی حیزبـی شاخ وەك دانتـۆن , مـارا , کـامی دیمـۆلان , سـان چۆسـت هـەروەها ڕۆبسپێر بوونە سیمبۆلی تیرۆر و ئازادی خەڵکیان گۆڕی بـە سـتەمی ڕێکخـراو . هـەر لـە ل٤٨٧ی کتێبەکـە هـاتووە : " ئـەو مەفسـەڵەی کۆتـایی بـە ژیـانی لویسـی

شازدەهەم و ماری هێنا بە هەمان شێوە کۆتایی بە ژیانی ڕۆبسپێر و دانتۆن و کامی دیمۆلان هێنا." لەوەدا دەفامرێتەوە شۆرشی فەرەنسی گۆڕینی ستەم بە ستەم بوو!

ئیسلامی میللی ناو کۆمەڵگای کوردی لە هەشتاکانەوە بەرەو کاڵبوونەوە چوو , چونکە میصریەکی زۆر هاتن بۆ باشووری کوردستان و ئەزموونی ئیخوانی مصریان گواستەوە کوردستان . وەك ئیدریس سیوەیلی دەبێژیت: ماڵباتی کوردی باشوور لە مێژ بوو لە ڕێگای صەوافەوە بە ئەزموونی ئیخوانی ئاشنا بوو . ئەمە و شۆرشی گەلانی ئیران لە ١٩٧٩ و داگیرکردنی ئەفغانستان لە لایەن سۆڤیەتەوە لە ١٩٨٠ و ئەزموونی حیزبی ئیسلامی کوردی لە شاخ , ئیسلامی میللی لە نێو کورد کاڵکردەوە و دەرگای لە سەر ئیسلامی ناو حیزبی ئیسلامی ناسراو بە "ئیسلامی سیاسی " لە نێو کورد دروست بوو !

لە دوای شەڕی کەنداوی یەکەم و دووەم ئیران و حکومەتی بەعس دەرگایان لە سەر ئیسلامی دەوڵەت کردەوە .

لە ئەزموونی ئەفغان و عیراقدا ئیسلامی سیاسی و ئیسلامی دەوڵەتی گەورەترین هەڕەشە بوون لە سەر خودی ئیسلام . سوپاس بۆ خوا لە کوردستان دا , ئەو دوو ئیسلامە نەبوونە چەك بۆ دژایەتی کردنی ئیسلامی میللی , بەلآم لە ئەفغان و عیراقی عەرەبیدا هەردوو ئیسلامی سیاسی و دەوڵەتی بوونە شۆرشی فەرەنسی بۆ خەڵك ؟ خەڵك بە گشتی بەرامبەر ڕەوشی ئەفغان سۆزی جوولا , بەلآم هەرکە حیزبی ئیسلامی هەرەسیان بە حوکمڕانی کۆمۆنیستی لە ئەفغانستان هێنا , وەك سەرکردەکانی شۆرشی فەرەنسی کەوتنە گیانی یەکتر !

له باشووری كوردستاندا به ماوەی چەند ساڵێك حیزبی ئیسلامی كوردی كەوتنه قۆناغی موراجەعەوە , بۆیه پەرگیری و توندڕەوی ئیسلامی له نێو كورددا زۆر دەگمەنه هەتا زۆربەی هەرە زۆری حیزبی ئیسلامی چەكدار وەك یەكگرتووی ئیسلامی بوونه حیزبی پەرلەمانی و دەستبەرداری مەكتەبی عەسكەری بوون .

له باشووری كوردستاندا ئێستا سێ ڕەوتی ئیسلامی له كوردستان هەیه :

١. حیزبی ئیسلامی پەرلەمانی
٢. ئیسلامی سۆفی , تەریقەتی , نەوقاف
٣. ئیسلامی سەلەفی

ئەو دوو تەیارەی كۆتایی دانووی زۆر لەگەڵ تەیاری حیزبی ئیسلامی ناگونجێت , بۆیه زۆربه له هەڵبژاردن هەواداری حیزبی عەلمانی كوردین!

## چەردەیەك لە مێژووی تەیاری ئیسلامی

## لە باشووری کوردستان

هەر لە سەدەی نۆزدەوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم چەندان ڕاپەڕین و بزاڤ لە کوردستان دا بەرپا بوون . پیاوی یەکەمی زۆربەی ئەو ڕاپەڕینانە , زانای موسڵمان یان هەڵگری پاشخانێکی موسڵمانی بوون وەك بەدرخان پاشا , عوبێدەڵلآی نەهری , شێخ عەبدلسەلام بارزانی , شێخ مەحموود بەرزنجی , شێخ سەعیدی کوردی ( بەدیع زەمان ), شێخ سەعیدی پیران , قازی موحەمەد , مەلا مستەفای بارزان .

ئەو بزاڤانە بزاڤی مەزهەبی و تەریقەت بوون , نەك ئیسلامی ڕێکخراوەیی ناسراو بە ئیسلامی سیاسی .

ئیسلامی ڕێکخراوەیی لە ناو کورددا تەمەنی کورتە . لە کتێبی ....ڕۆژنامەگەری ئیسلامی , ئاماژەم بە هەبوونی ئەو جۆرە بزاڤە کردووە , کە زادەی سێ هۆکارن :

١. شۆڕشی گەلانی ئیران-١٩٧٩ ,
٢. شۆڕشی ئۆپۆزسیۆنی ئەفغانی ئیسلامی -١٩٨٠ ,
٣. کارەساتی هەڵەبجە و ڕادونانی کەسانی ئیسلامی ١٩٨٧ .

ئەو سێ فاکتەرە و ئاوارەبوونی کورد بەرەو ئەوروپا و ئەمریکا , ڕۆڵی سەرەکیان بینی لە کۆکردنەوەی بابای ئیسلامی لە ڕێکخراوێکدا .

## یەكەم / لەشكری ئیسلامی

پاش دوو ساڵ لە شۆرشی گەلانی ئێران و ساڵێك دوای شەڕی یەكەمی كەنداو ناسراو بە شەڕی ئێران و عیراق , ڕەوتێكی ئیسلامی چەكدار لە كوردە ئاوارەكانی بە ناوی لەشكری ئیسلامی دروست بوو , كەواتە ئەو لەشكرە لە ساڵی ۱۹۸۱ دروست بوو , كەچی جەمال نەبەزی دانیشتووی ئەلمانیا لە دوای شەستەكانەوە ,لە لاپەڕە ۱٤٤ی دەربارەی دامەزراندنی لەشكری ئیسلام دەنووسێت :" لەشكری ئیسلامی كە لە ساڵی ۱۹۸۰ دروست بوون ....دوای دروستبوونی دەوڵەتی خومەینی بە چەند مانگێك." هەر خۆشی لە لاپەڕە ۱٤٥ شتێكی پێچەوانە دەنووسێت :" كە پێشمەرگەكانی لەشكری ئیسلامی ڕەتیكردەوە كە هاوشانی سوپای ئێران بچێتە سەنگەرەوە شەڕی سوپای عیراقی بكات "

لە لایەكی دی ئامانجەكانی لەشكری ئیسلامی لەگەڵ ئامانجەكانی دەوڵەتی خومەینی یەكینەدەگرتەوە , لەشكری ئیسلامی كوردی وەك فارس تەماشا دەكرد , هەرچی دەوڵەتی ئێرانی بوو هەر دەوڵەتەكەی شاهنشای ئێرانی بوو تەنیا بە بۆیەی شیعەگەریی. ئەو گردبوونەوە ئیسلامیە , بوونە پارووی چەوری حیزبێكی چەپی كوردی , بۆیە زۆر بەرگەیان نەگرت و هەڵوەشانەوە !

## دووەم / پەیوەندی قوتابیانی موسڵمانی کورد

ئەو پەیوەندیە پەیوەندیەکی میدیایی بوو , نەك چەکداری و سیاسی . ئەو پەیوەندیە لە ساڵی ١٩٨٦ لە لای دکتۆر ئازاد گەرمیانی لە کەنەدا دروست بوو . ئاڵای ئیسلام گۆڤاری زمانحاڵی ئەو گروپە بووە .

## سێیەم / بزوتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی

ئەو پەیوەندیە تەواو جودا بوو لە پەیوەندیەکەی سەرەوە . بزوتنەوەی پەیوەندی بە سەرکردایەتی موحەمەد بەرزنجی بوو , پەیوەندیەکی تەواو چەکداری بوو , زیاتر ئەندامەکانی هەڵەبجەیی و دەوروبەری بوون . ئەو بزوتنەوەیە لە ساڵی ١٩٨٤ دروست بوو .

## چوارەم / بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عیراق

پاش چوونە دەرەوەی مالّباتی مەلا عوسمان عەبدولعەزیز , پەیوەندیەکەی بەرزنجی بووە بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عیراق . بزووتنەوە لە سالّی ۱۹۸۷ دروست بوو . ئەو بزووتنەوەیە هەلگری چەند بالّێك بوو , کە زۆربە قەبوولّی هەژموون و بێ سەر و بەری مالّباتی مەلا عوسمانی ڕەحمەتیان نەبوو , بۆیە دوای ڕاپەڕین یەك لە دوای یەك لە بزووتنەوە جیابوونەوە , وەك :

١. کۆمەلّەی جیهاد –گروپی مەلا ئەمین
٢. کۆمەلّەی ئیصلاح –مەلا کرێکار
٣. هێزی سۆران :
   أ. جوندی ئیسلام
   ب. تەوحید
   ت. حەماس
٤. کۆمەلّی ئیسلامی –عەلی باپیر

کەواتە دەکرێ بلّێین چارەنووسی بزووتنەوەی ئیسلامی وەك پارتی دیموکراتی کوردستان بوو , ئەویش لایەنە ناکۆکەکانی وەك یەکێتی و سۆشیالیست و پارتی گەلی ...لێ جیابۆوە .

جەمال نەبەز لە لاپەڕە ١٤٨ دا شتێکی بێناگا لە ناسنامەی حیزبی ئیسلامی دەنووسێت :" دوای سوپای ئیسلامی کوردی لێکهەلّوەشێندران , بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان دروست بوو , بە ناوی یەکگرتووی ئیسلامی بۆ کوردستانی عیراق , بە سەرکردایەتی مەلا عوسمان عەبدولعەزیز... "

## پێنجەم / یەکگرتووی ئیسلامی لە کوردستان -١٩٩٤.

دوای شەڕی کۆتایی ١٩٩٣ , یەکێتی وەك یەکێتیەکەی شاخ شەڕی دژی بزووتنەوە هەڵگیرساند و بزووتنەوەی لە شار دەرکرد هەروەها لە سەرەتای مایسی ١٩٩٤ شەڕی دژی پارتی هاوپەیمانی هەڵگیرساند هەتا ١٩٩٨ بەردەوام بوو . یەکگرتوو وەك حیزبێکی ئیسلامی میانڕەو ناسراو بە ئیخوانی کوردی لە ٦ی شوباتی ١٩٩٤ جاری دروست بوونی خۆی دا , ئەو مێژووە دەکەوتە نێوان هەردوو شەڕی ١٩٩٣ و ١٩٩٤ . ئەو حیزبە تەواو جودابوو لە بزووتنەوە , ئەوەی ئاگاداربێت لە ڕەوتی ئیسلامی کوردی دەزانێت: لە نێوان بزوتنەوە و یەکگرتوو خیلاقی فیکری هەبوو , کەواتە بە هیچ جۆرێك یەکنەبوون.

یەکگرتوو بە سەرکردایەتی صەلاحەدین بەهائەدین بوو , بزوتنەوەی ئیسلامیش بە سەرکردایەتی مەلا عوسمان بوو . !

هەر لە هەمان لاپەڕەدا جەمال نەبەز هەردوو حیزبی بزووتنەوە و یەکگرتوو تێکەڵ یەك دەکات و دەنووسێت :" بزوتنەوە ڕۆژنامەی یەکگرتوو دەردەکات ". هەر کەسی ئاسایی دەزانێت , ئەمە زۆر دوورە لە ڕاستیەوە , بزوتنەوە چەکدار بوو , یەکگرتوو بێ چەك ! ڕۆژنامەی یەکگرتوو حیزبی یەکگرتوو , نەك بزوتنەوە دەریدەکات ! جگە لە ڕەوتی سەلەفی و سۆفی , سێ حیزبی ئیسلامی لە پەرلەمانی کوردستان هەیە هەن :

١. یەکگرتوو -١٠ کورسی ,
٢. کۆمەڵ - ٦ کورسی ,
٣. بزووتنەوە — ١ کورسی !

بە حوکمی ئەوەی ئەو سێ حیزبە لە یەك بەرە یا لیست نیین , بۆیە قورسایەکەیان پەرت بووە .

## جیۆگرافیای دابەشبوونی ئیسلامیەکانی
## دەرەوەی حیزبی ئیسلامی

لە ماوەی شۆڕشی نوێی کوردیدا , سێ حیزبی بالآدەستی عەلمانی لە کوردستاندا هەبوون : ١. یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ( کۆمەڵە , بزوتنەوەی سۆشیالیست , هێزی پان )

٢. پارتی دیموکراتی کوردستان

٣. حیزبی شیوعی کوردستان

ڕێژەی ئیسلامی لە نێو ئەو حیزبانە لە شاخ جودا بوون , بە حوکمی ئەوەی یەکێتی و شیوعی دوو تەیاری سەرسەختی مارکسی بوون , بۆیە باباى ئیسلامی لە نێو ئەو دوو حیزبە و جیابووەکانی وەك سۆشیالیست و زەحمەتکێش و ئاڵای شۆرش بە دەگمەن دەبیندران , بەلآم لە نێو پارتیدا تەیاری وەك ( حیزب الله شۆرشگێری کوردی ) و تاك و کەسایەتی دەبیندران .

دوای هەرەسی دەستەجەمعی حیزبی کوردی لە ١٩٨٨ و پرۆژەی پرۆسترۆیکا و گلاسنۆستی گۆرباتچۆڤ و هەڵوەشاندنەوەی حوکمڕانی کۆمۆنیستی لە شورەوی و ئەوروپای شەرقی , وایکرد دروشمی ئایدیۆلۆژی لای حیزبی عەلمانی کورد لە باشوور کاڵببێتەوە .

ئەو کاڵبوونەوە و سەرهەڵدان و هەرەسی حیزبی ئیسلامی لە ماوەی ١٩٩١-١٩٩٣ حوکمڕانی کوردیدا , حیزبی عەلمانی کوردی سیخناخ کرد بە ئیسلامی کوردی .

له ۲۰۰۳ دا به رێکی له ۹ی چواری ۲۰۰۳دا هەم رژێمی صەدام روخا هەم هەژموون و کاریزمای ئەمریکا له باشوور دروست بوو . لەو ماوەیەدا شەپۆلێکی دەوڵەمەندبوون رووی کرده باشوور هەروەها بزوتنەوەیەك بە ناوی بزوتنەوەی گۆران له یەکێتی جیاببێتەوە .

دووباره سێ حیزبی عەلمانی له کوردستان دروست بوون :

۱. پارتی ,
۲. گۆران ,
۳. یەکێتی .

لەو سێ حیزبە دەوڵەمەندەدا بە پێچەوانەی چیاوە هەندێ تاکی ئیسلامی پشتیان لە حیزبی ئیسلامی کرد , لە نێو ئەو سێ حیزبەدا درێژمیان بە خەباتی مەدەنی و پەرلەمانتاری دا . لە چەندان دیداردا قسەکەر و ئەندامی ئەو سێ حیزبە بە راشکاوی دەبێژن : " پیاوی ئایینی ناو حیزبەکانمان خاوەن هیچ ئەجێندایەکی ئیسلامی نیین , تەواو باوەڕیان بە ئەجێندای لیستی حیزبەوە هەیە ."

ئەوانە و زۆربەی کەسی سەلەفی و سۆفی و مەلا و مامۆستای زانکۆ و دەروێش ... هەموو وەك با و باران وابوون بۆ حیزبی ئیسلامی میانڕەو , مەدەنی پاشخان جیهادی , بۆیە دەنگی ئیسلامی لە ماوەی ۲۲ ساڵی نێوان ۱۹۹۲-۲۰۱٤ وەك شوناس هەڵگرێکی جیاکەرەوە لە ۱۷ی کورسی پەرلەمانی تێپەری نەکردووە . بە رای من , جیا لە فاکتەری ئیسلامیبوون لە نێو حیزبی عەلمانیدا , ئەو پاشاگەردانیەی ئیسلامیەکان لە پەرلەمان دەگەرێتەوە بۆ وابەستبوون بە رەوشی ئیسلامی عەرەبی , کە ئەوە نزیکەی سەدەیەکە لە دەرەوەی دەسەلاتن .

## ململانێی نێو ئیسلامیەكانی حیزبی عەلمانی

پێشتر ئیسلامیەكانی ناو حیزبی عەلمانی لە بەرەی بەرگری دا لە ژێر یەك چەتردا بوون , بۆ نموونە قادریەكانی دەڤەری سلێمانی سەرسەختانە دژ بە ئینگلیز و سوپای عەرەبی شەڕیان دەكرد , كەچی زۆربەی ڕۆشنبیرە ناسراوەكانی ئەوسا نە تەواو لەگەڵ شێخ مەحموود قادری بوون , نە سلەمینەوەش لە دروستكردنی عیراق لە ڕووی سەربازی و پەروەردەیی!

لەولاوەش بەرەی نەقشەبەندی لە سیەكانی سەدەی بیستەم زۆر نازایانە ڕووبەڕوو ئینگلیز و سوپای عیراق بوونەوە . نوسەرێك بە ناوی كاكەزیاد لە ڕۆژنامەی ڕابوونەوە لە وتارێكدا جەختی لە سەر ئەوە كردبوو لە نۆوەدەكان , كە ئەو ئیسلامیەتەی زۆربەی شۆرشەكانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەوە , زادەی مەزهەبیەت بوون , نەك ئیسلامی , بە واتایەكی دی ئەوە مەزهەبیەت بوو دنەی خەلكی دەدا بۆ شۆرش كردن , ئەو ڕۆلە مەزهەبیە , حیزبی ئیسلامی پێی ناكرێت , بە ڕای من هێندە پرانسیپەكانی مەزهەبیەت شۆڕبۆتەوە بۆ ناو خەلكی عەوام وەك مەرقەد بە پیرۆزراگرتن , نوشتەكردن ... , هێندە پرانسیپەكانی ئیسلام شۆڕنەبۆتەوە ناو ڕێزەكانی خەلك !

كەچی لە ڕەوشی هێوری و ململانێوە جیاوازی هەردوو بەرەی قادری و نەقشەبەندی , بۆتە هۆی جیاوازی حیزبەكانەوە . عەتا قەرەداغی لە وتارێكی گۆڤاری سەراب دا ململانێی نۆوەدەكانی هەردوو حیزبی باشووری كوردستان , بە ململانێی قادری و نەقشەبەندی نێوزەد دەكات ...

هەردوو بەرە لە سەر ئەوە كۆكن كە دژایەتی ئیسلامیەكانی ناو حیزبی ئیسلامی و ئیسلامیەكانی ناو حیزبی عەلمانی بكەن .

## ململانێی سۆفیگەری و سەلەفی

هەرچەندە (سۆفی و سەلەفی ) لە سێ پیت هاوبەشن , بەڵام تەواو دژبەیەکن لە جیهانبینیەوە , بۆنموونە نزیك بوونەوە تاك لە خودا لای سۆفی بە جۆرێکە و لای سەلەفی بە جۆرێکی تر !

هەردوو بە زۆری لە نێو حیزبی عەلمانین , نەك ئیسلامی . سەلەفی و ئەزهەر( وەك نوێنەری سۆفیەکان ) لە کێشەی میصردا بەشداربوون لە کودەتای ( سیسی ) دا , کەچی چەندان ساڵە بێدەنگ بوون بەرامبەر سادات و موبارەك!

لەوانەیە ئەوە لە سەلەفی و ئەزهەریەکان بپرسرێت , ئاخۆ گرینگە بۆ هاونیشتمان سیسی یان مرسی وەلی ئەمر بێت ؟!

لە کوردستانیش بەتایبەتی باشوورەکەی لە گەمەی هەڵبژاردنەوە زۆربەی سۆفی و سەلەفیەکان کۆکن لە سەر ئەوەی دەنگ بە حیزبی عەلمانی بدەن .

من دەڵێم باشوور , چونکە لە رۆژئاوا , پاش ئەوەی مارکسیەت لە دەبلەوە کوژایەوە , ئەوە زۆربەی ئەوان تازە حیزبی چەپ دروست دەکەن . هەروەها ململانێیەکی سەخت لە نێوان( تەقدەم ) و (ئەنەکەسە) هەیە , کە زیاتر لە ململانێی ( یەکەکە+یەکێتی ) و پارتی دەچێت هەروەها بەرەو زیندووکردنەوەی توێژی ( گەنج ) و ( پیر ) دەچێت , بۆیە هیچ دەرفەتێك بۆ حیزبی ئیسلامی کوردی نەماوە !

## داعش و حیزبی ئیسلامی کوردی

حیزبی ئیسلامی کوردی لە مێژووی خۆیدا , دوو جار هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبی ( پێشینە چەپ ) کردووە وەك ( سۆسیالیست+ زەحمەتکێشان ) و ( گۆڕان ) , لە هەردوو هاوپەیمانیدا ڕەنج بە خەسار بوو , ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە دەرگای ئاشتبوونەوە لەگەڵ سۆفی + سەلەفی +ئەوقافی...بکاتەوە ؟؟

لە لایەکی دی , تەیارێکی دی ئیسلامی کە بەرهەمی لایەنی مێژوویی ئیسلامییە خەریکە هەڕەشە لە هەموو تەیارێکی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی کوردی دەکات . بیرکردنەوەی داعش کۆتایی بە فرەلایەنی ئیسلامی کوردی هێنا. داعش وەك بزافێکی توندڕەو قەبوولی سۆفی و سەلەفی و حیزبی میانڕەو و مەدەنی کوردی ناکات . کردەوەی داعش بەرانبەر مەزارگەکانی سۆفی هەروەها هەڕەشەکانی داعش لە سەرۆکی ڕابیتەی ئیسلامی کورد و ئەمیری کۆمەڵەی ئیسلامی باشترین بەلگەن .

## ئیسلامی نا-مونتەمی

هەبوونی کادری ئیسلامی لە نێو حیزبی عەلمانی و حیزبی ئیسلامی , ناسنامە و ئاراستە و بەرژەوەندیەکی کەسی دروستکردووە . لە نێو حیزبی عەلمانیدا , کادری ئیسلامی مەنزلگایەکی ماددی بۆ دروست دەکرێت , لەولاوەش کادری حیزبی ئیسلامی لە میدیا و حیزبی ئیسلامی دا جێیەك بۆ خۆی دەکاتەوە , کەواتە هەموو ئیسلامیەکانی سەلەفی و سۆفی و ... ناو حیزبە ئیسلامیەکانی کوردستان کەم و زۆر پایەکی ماددی بۆ خۆیان دابین دەکەن ... ئەوانەی لە دەرەوەی هەردوو حیزبن , عەلمانی و ئیسلامی لە هەر پایەکی ماددی دوورن , موسڵمانی نا-مونتەمین!

# بەشی سێیەم

# ئینتیمای ئایدیۆلۆژی و نەتەوەیی

<u>ئەم بابەتە لە چەند تەوەرمیەکدا تاوتوێ دەکەین :</u>

## شوناسی ئیسلامی

کە باوەڕ لە ئایدیۆلۆژیا بچووککرایەوە , باوەڕ زۆر کاڵکرایەوە هەروەها پۆشاکێکی نیفاقی بەبەرکرا, ڕەوتەکە بەرەو ئاقارێکی تر دەچێت .

لە ١٩٨٨ دیاردەی فرەحیزبی و فرمئایدیۆلۆژی حیزبی عەلمانی کوردی وەك تاكحیزبی کوردی ١٩٧٥ هەرەسی هێنا .پێش ئەو هەرەسە هیچ ئەزموونێکی سیاسی ئیسلامی نەبوو , ئەوەی حوکمی دەکرد ئیسلامی میللی بوو , ئەو ئیسلامەش زیاتر تەریقەت ئامێز بوو .

ئەو ڕەوتە ئیسلامیە میللیە دەیویست سیما و ڕواڵەتێکی ئیسلامی میللی بە بزافی کورد بدات بۆ ئەوەی شوناسی ئیسلامی بۆ کورد بگەڕێنێتەوە .شوناسی مارکسی ببووە مۆرکێك لە بزافی کوردیدا , ئەو ڕەوتە تەریقەت ئامێزانە دەیانویست شان بە شانی مارکسیەکانی کورد , لە ژێر ئاڵای ئیسلام خەبات بکەن .

دوای هەرەس هەژموونی تەیاری مارکسی بە سەر تەیاری کوردایەتی زاڵ بوو هەتا کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان . لە

شوباتی ۱۹۷۹ شۆڕشی گەلان لە ئێران بە سەرکردایەتی خومێنی ( شیعە ) چەپەکان ( دیموکرات ) و مفتی زادە ( خومێنی کوردە سوننیەکان ) سەرکەوت , هەرزوو ململانێ کەوتە نێوان هەر سێ لا , بە سەرکەوتنی خومێنی کۆتایی هات . خەباتێکی حیزبی ئیسلامی لە چیا دروست بوو , بەڵام هەرزوو حیزبی چەپی کوردی باشوور کۆتایی پێ هێنان .

ئەو خەباتە ئیسلامیەی شاخ تەمەن کورت بوو , بۆیە کە قسە لە سەر حیزبی ئیسلامی کوردی دەکەین , ئاماژە بە تەمەنی حیزبی ئیسلامی لە شار دەکەین.

لە نێو شاری کوردیدا لە ماوەی ئەو ۲۳ ساڵەدا سێ حیزبی ئیسلامی میانڕەو و پەرلەمانی هەن :

١. بزووتنەوەی ئیسلامی
٢. یەکگرتووی ئیسلامی
٣. کۆمەڵی ئیسلامی

حیزبی تری ئیسلامی کوردی هەن وەك ئەنصار ئیسلام و تەوحید , بەڵام ئەو حیزبانە لە دەرەوەی شاری کوردی و پەرلەمانی کوردستانین .

جگە لەو حیزبانە کۆمەڵێکی تر هەن وەك

١. یەکێتی زانایانی ئیسلامی
٢. ڕەوتی سەلەفی
٣. نەقشەبەندی
٤. قادری

بەلاّم ئەو چوار ڕەوتە بە زۆری لە دەرەوەی حیزبی ئیسلامی کوردین , بۆیە ئەوانە , لە دیدی کادیری ئیسلامی , بوونەتە هۆی لاوازکردنی حیزبی ئیسلامی کوردی , چونکە هەردەم هاوسۆزی حیزبی عەلمانی کوردین بە تایبەتی دەسەلاّتدارەکان .

## غیابی ئیسلامی کوردی

لە نێو بزاڤە ئیسلامیەکانی عەرەب , فارس , تورك ...دا , مۆرکی نەتەوەیی حزور و ئامادەگی هەیە هەروەها ئەوها تەماشای ( برایەتی ئیسلامی ) بە تایبەتی کورد دەکەن , ئەوان خاوەن دەوڵەت بن , کوردیش پاشکۆ ., بەلاّم ئیسلامی کورد هەر بەرگری لە شوناسی برایەتی ئیسلامی کردووە , حسێبیشی بۆ کردووە , بۆیە دەبینین لە نێو عەوامی کوردا دووچاری ڕەخنە بوونەتەوە .

ئەو نەتەوانە ئیسلامیان وەك میکانیزم بەکارهێناوە , کەچی کورد وەك ستراتیژیەت .ئەوە وایکردووە ئیسلامی عەرەب و فارس و تورك هەبێت , بەلاّم ئیسلامێکی کوردی تازە (٢٠١٥ ) دەرکەوێت . زۆر سەرکردەی یەکگرتوو باوەڕی بە ( ئیخوانیەت ) لەق بووە , چونکە هەستدەکات لە مصر و هەندێ دەوڵەتی عەرەبی ئیخوانیەت بۆتە عروبایەتی هەروەها ئەو ڕەوتەش حوکمڕانی پێناکرێت . ئەو عروبیەتەی ئیسلامی عیراقی بوو , کۆمەڵی ئیسلامی ناچارکرد ئەویش وەك عەرەب ئیعلانی دەوڵەتی کوردستان بکات !

کەواتە حیزبی ئیسلامی کوردی پێش حیزبی عەلمانی کوردی لە گوفتار و ڕەفتاری عەرەبی عیراقی گەیشتووە , کە کار بەو فەرموودە

گەردوونیە ناكەن , كە دەڵێت :" ئیمانی تەواو نابێت , تا ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە , بۆ براكەشت پێت خۆش نەبێت ." حوكمڕانی عەرەبی عێراقی سوننە و شیعە هەروەها ڕۆناكبیرەكانی بە هەموو ئایدیۆلۆژیایەكی سیاسیەوە قەبووڵی دەوڵەتێكی كوردی لە باشووری كوردستان ناكەن .

كەواتە شوناسی ئیسلامی كوردی باشووری كوردستان , شوناسی ئیسلامی میللی ( تەریقەت ) , حیزبی ئیسلامی و مرۆی نامونتەمییە.

## ئینتیمای نەتەوەیی و ئایدیۆلۆژی

قسەكردن لە سەر ئینتیمابوون كارێكی فرە دژوارە , بە تایبەتی هەردوو ئینتیمابوونی نەتەوەیی و ئایدیۆلۆژی , چونكە لە هەندێ بواردا یەكتر ڕەشدەكەنەوە , ئینتیمای قەومی ئەبولەهەب و ئەبوجەهل و ئەبوبكر لە ژێر یەك چەتر كۆدەكاتەوە , سەبارەت بە كوردیش( پێشمەرگە ) و( جاشی پێشڕەوی هۆلۆكۆستی كوردی ) بە یەكەوە گرێدەدا , چونكە لە هەردوو حاڵەتدا فاكتەری ( هاوڕەگەزی ) و هاو نەتنیكی ) ئامادەگی هەیە. كەواتە كەسی هۆشمەند قەبووڵی ڕەشۆكی حزوری ئابووری و نهێنی پارێزی و هەست و باوەڕ ئەو پێكەوەبوونەی تاكەكانی نەتەوە دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

كەواتە ئەو ئینتما خۆرسكە , كە نەتەوە و ئەتنیك دەكاتە بنەما , لای زۆربەی كورد قەبوولكراو نییە هەروەها ئیسلامیش قەبووڵی ئەوە ناكات ئەبوجەهل و ئەبوبەكر لە ژێر یەك چەتر بن . ناسیۆنالیستی

کوردیش قەبوڵی ئەوە ناکات ( پێشمەرگە ) و ( جاش ) لە بن یەك چەتر بن , کەواتە بە کورتی بزافی ئیسلامی و بزافی ناسیۆنالیستی کورد قەبووڵی ئەو ئینتیمایە ناکەن . دەبێ ئەو دوو ڕەوتە چ ئینتیمایەك قەبوڵ بکەن ؟؟؟

## ئینتیمابوون :

## چەمکی ئینتیمابوون – وابەستەبوون

ئینتیمابوون –وابەستەبوون پەیوەستە بە پیرۆزیەکانی نیشتیمان و کەسانی ناو نیشتیمان , بەڵام جۆری پەیوەندی تاك بە تاکەوە لە سەر بنەمای وابەستبوونی ئەو تاکەیە بە نیشتیمانەوە , کەواتە لە مەسەلەی ئینتیماوەوە , دوو ڕەگەز ئامادەگیان لە هاوکێشەکە هەیە.

## نەتەوە – نیشتیمان

نەتەوە کۆمەڵە کەسانێکی هاوڕەگەز و هاو زمان و هاو کەلتوور و هاو مێژوون , لە هەمووش گرینگتر خاوەن یەك نیشتمانن. لە سەر مەسەلەی ئینتیماوە بۆ بە دەستهێنانی شوناسی نەتەوەیی لەگەڵ هزرەوە ڕەگەزیتر زیاددەکرێ , بۆ نموونە مارکسیەکان بە تایبەتی ستالینەکان ڕەگەزی ( ئابووری هاوبەش ) دەکەنە مەرج بۆ یەك شوناسی قەومیبوون و نومەمیبوون .قەومیەکان بە تایبەتی هەڵگرانی بیری نەتەوەیی کوردی , کە خۆیان بە قوتابی ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی دەزانن, لە هەردوو پارتی ( کاژیك ) و ( پاسۆك ) دوو ڕەگەزی زۆر گرینگ بۆ یەك شوناسی زیاد دەکەن , ئەویش هەردوو ڕەگەزی ( پاراستنی نهێنی ) و (

شۆڕبونەوەی هەست ).کامیل ژیر دەربارەی پاراستنی نهێنی دەڵێت : ئەو کەسەی دەبووە کاژێك دەبوو عەیار ٢٤ بوایە , شێرکۆ بێکەسی کۆنە کاژیك دەڵێت : دەبوو کەسی کاژێك نهێنی پارێز بووایە , بۆیە بۆ ئینتیمابوون بە کاژیکەوە , دەبوو ئەو کەسە ٤ ساڵ چاوەڕێی بکردایە.

پاش فاکتەری نهێنی پارێزی , بە سود وەرگرتن لە ناسیۆنالیزمی فەرەنسی و ئەلمانی و ئیتالی , ئازاد مستەفا ی پاسۆك لە نامیلکەی نەتەوە و نەتەوایەتی-دا کوردایەتی بەستەوە بە فاکتەری ( هەست ).هەرکە ئەو هەستە دەرکی پێ کرا و کاری بۆ کرا , تاکی کورد دەبێتە پاسۆك!

ئیسلامیە چەکدار و مەدەنیەکانی کورد چاك دەزانن کە لە ٢٥ پێغەمبەری نێو قورئان دا , ٢٣ پێغەمبەر بە ڕەگەز و زمان پێغەمبەری نەتەوە بوونە , زۆربەی ئیسلامیەکانی جیهان , کەلتوور و مۆرکی نەتەوەکەیان لە نێو پانتایی فراوانی ئیسلام جێ کردۆتەوە , بەڵام زۆربەی ئیسلامی کورد لە بەرایدا ( کاری ئومەی ئیسلامی ) وەپێش (کاری ئومەی نەتەوە ) ئێخستبوو .

لە پاش ٢٠٠٣ حیزبی ئیسلامی کوردی لەو بیرۆکەیە ساردبۆوە , زۆر گەرمتر لە حیزبی عەلمانی داوای دەوڵەتی کوردستانیان کرد لە باشووری کوردستاندا !ئەو پرۆسەیان دواخست , کە تەنیا هۆکاری( باوەڕبوون بە خوا ) نەتەوە لە نەتەوەوە بگوازنەوە بەرەو ئومە , لەو بارەیەوەشەوە خودا لە قورئان دەفەرموێ ( ئەوە ئومەتی یەکانەی ئێوەیە , من خودای ئێوەم (بم پەرستن ) ( تەقوای خودا بکەن )...کێشەکەش ئەوەیە , وەك گوتمان

ئیسلامی عەرەب و ئیسلامی تورك و ئیسلامی فارس بە پێوەری قورئانی ئیسلامی کوردی نەخوێندەوە!

ئەو دوو فاکتەرە وەیکرد , هەردوو حیزبی ئیسلامی کوردی پێش حیزبی دی بە هەژموون , دەوڵەتی کوردستانی لە کۆنگرەکانیان باس بکەن و بیکەنە ستراتیژیەتی حیزب .

## دوو نیشتمان

لە ئیسلامدا دوو نیشتمان ئامادەگی هەیە :

أ . نیشتیمانی نەتەوە ( زێد )

ب. نیشتیمانی ئوممە ( نیشتیمانی باوەڕ و سیاسی )

لە سیرەی پێغەمبەردا هەردوو نیشتیمان هەن , ئەگەر قورەیشیەکانی دەسەلاتی عەرەبی بتپەرست زۆر فشاریان لە پێغەمبەر نەکردبووایە , مەککەی زێدی بەجێنەدەهێشت , چونکە مەککەی زۆر خۆشدەویست . مەککە وەك زێدی منالی و هەرزەکاری و پێغەمبەرایەتی بەرایی لە زهنی پێغەمبەر ئامادەگی هەبوو .

کە لە مەدینەدا دەوڵەتی هاولاتی دامەزراند , دەوڵەتی ئومە دروستبوو لە سەلمانی فارسی , بیلالی ئەسیوبی ( حەبەشی ) , صوهەیبی رۆمی , هەمزەی عەرەبی , جاوانی کوردی . کەواتە لە ئیسلامدا نیشتیمانی نەتەوە و نیشتیمانی هاولاتی هەیە .

## چەمكی نیشتیمان لە نێوان بچووكبوون و فراوانبوون

هەتا دەسەڵاتی حوكمڕانی ئیسلامی هەبوو : دەوڵەتی ڕاشدین , ئەمەوی , عەباسی , عوسمانی سنوور لە نێو نیشتیمانی ئیسلامی نەبوو.كورد لە دەوڵەتی عوسمانیدا چەند میرنشێنێكی ناوچەگەری هەبوو , وەك میرنشینی بۆتان , میرنشینی بابان , میرنشینی سۆران , میرنشینی بادینان.....

## نیشتیمان قەڵەمڕەوی میر

چەمكی نیشتیمان لەو میرنشینانە بریتی بوو لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی میر ! (قەڵەمڕەوی میر ) و ( ئاقاری میرنشین ) دوو چەمكی زهنیەتی زۆربەی میرەكانی كورد بوون , سەرانەی میر یان خەلیفەی عوسمانی لەو قەڵەمڕەوی و ئاقارە وەردەگیرا !لە هەمووش ترسناكتر ئەو میرنشینانە دەوڵەتی بنەماڵە بوون , كەم هەبوو ئەو میرانە كچ و خوشكی خۆیان بدەنە عەوامی –ڕەشۆكی كۆمەڵگا هەروەها هەردەم لەگەڵ میرنشینی هاوسێیان لە شەڕ دابوون...

## نیشتیمان : دەوڵەتی ناو دەوڵەت

لە دوای هەڵوەشاندنەوەی دوا حوكمڕانی ئیسلامی لە سەرەتای سەدەی بیستەم , ئینگلیز و فەرەنسا چەند دەوڵەتێكی قەومی بۆ عەرەب و

تورك و فارس ...دروستکرد. نیشتیمانی کورد به پێی پلانی سایکس -بیکۆ له نێو ( دەوڵەتی عەرەبی ) و ( دەوڵەتی فارسی ) و ( دەوڵەتی تورکی ) دیارکرا . بۆ نموونه باشووری کوردستان له دەوڵەتی عەرەبی عیراقیدا , له ناوچەی نۆتۆنۆمی کورتکرایەوه , ئێستاش پاش نەمانی ڕژێمی صەدام , دەسەلاتی عەرەبی شیعه له عیراقدا ڕژده له سەر ئەوەی کوردستان , تەنیا سێ شارەکەی ( هەرێمی کوردستان )-ه.

## نیشتیمانی کورد له دەسەلاتی کوردی

## ۱۹۹۲ - ۲۰۱۵

نیشتیمانی کورد له دەسەلاتی کوردیدا , جگه له هەرێمی کوردستاندا ئەو خاکانەش له سەر ( کاغەز ) دەگرێتەوه که ڕژێمی صەدام و دەسەلاتی شیعەی عیراق دانی پێنانێن , بۆیه دەسەلاتی کوردی و دەسەلاتی شیعەی عەرەب هەر له ناکۆکی دان. له شەڕی داعش لەگەڵ مالیکدا , کورد زۆربەی خاکی کوردی دەرەوەی هەرێمی گەراندەوه . باشووری کوردستان به ڕەسمی تەنیا هەرێمی کوردستانه ( هەولێر +سلێمانی +دهۆك ) , ئەو هەرێمەش له پاش هەرای ۱۹۹٤ ەوه هەتا ئێستا بۆته دوو زۆن-دەڤەر !

## نەتەوه و ژماره

دروستبوونی فۆرمەڵەی نەتەوه پەیوەندی به ژمارەوه ونییه . ڕاسته کورد نزیکەی چل ملیۆن دەبێت , بەلام هەر له سەردەمی

میرنشینەکانەوە پەرتەوازە بووە و وەلای هێندە بۆ عەشیرەت و دەڤەر هەبووە , وەلای بۆ کوردستانی گەورە نەبووە!

کەواتە کورد وەك نەتەوە , جێگای پرسیارە لای حیزبی عەلمانی کوردی .ئەو پەرتەوازەییەش زیاتر حیزبی کوردی دروستی کرد بە تایبەتی حیزبی مارکسی کوردی , کە لە هیچ پارچەیەکی کوردستاندا لەگەڵ یەك تەبا نین. ئەو تەبانەبوونەش کاری لە فۆرمی نەتەوەبوون کرد و خستیە ژێر گومانەوە .

لەو ڕوانگەوە نەتەوەبوون ناوەستێتە سەر ژمارەوە , بەڵکو دەوەستێتەوە سەر هەست و کارەوە.

## ئینتیمای نەتەوەیی – ئینتیمای ئایدیۆلۆژی

## ئینتیمای نەتەوەیی

ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لە دەڤەری باشووری کوردستان دەژین , چەند ئەدگارێك کۆیاندەکاتەوە وەك هاوکەلتوری , هاومێژوویی , هاوخاکیی ...کورد لە باشووردا ڕێژەیەکی زۆر موسلمانن کە دەگاتە سەدا٩٠٪ , ئەوانی تر دیان –کریسچیەن , کاکەیی , ئێزیدین . ئینتیمای نەتەوەیی هەموویان هەروەها فاکتەری ڕەگەزی ( برای ڕەگەزی ) و فاکتەری ئینسانی ( برای ئینسانی ) کۆیاندەکاتەوە.

لە لایەکی دی نەتەوەی دی لە باشووری کوردستان هەن وەك تورکمان , ئاشووری , کلدانی , بۆیە لە قۆناغی شار و پەرلەمانی

کوردستاندا وا دەخوازرێت کە ( سرودی نیشتیمانی ) و ( ئاڵای کوردستان ) گوزارشت لەو ڕەنگاڵییە هەمە ڕەنگیە و هەمە نەتەوەدا بکات .

## شاخ و ئینتیما – شار و ئینتیما

هەتا پێشمەرگە لە شاخ بوون , ئینتیمای تاکی شار چ لە ڕووی نەتەوەیی یا ئایدیۆلۆژیە بەرز بوو , بۆیە تاکی شار لە نێو دامودەزگای بەعسدا وەك پێشمەرگە خەباتیان دەکرد , بۆیە ئەوان لە پێشمەرگە زیاتر دەگیران و دەکوژران !

لە دوای ڕاپەرینی ١٩٩١ دا, خەڵکی شار ڕووبەروو ئاشنای حیزبی کوردی بوو .ئەو وێنەیەی لە زاکیرەبوو دەربارەی حیزبی کوردی تووشی نسکۆی دەروونی کردن . تێڕوانینی خەڵکی شار بەرانبەر حیزبی کوردی لەگەڵ ئەم پەندە کوردیە تەریب بوون :

## "دوورکوژی نزیك خەساربوون"

هەرکە بەرەی کوردستانی ئیعلانی هەڵبژاردنی کرد , زۆربەی حیزبی عەلمانی کوردی پێشینە چەپ بوون , ئەو هزرە و پەرلەمان وەك دام و دەزگایەکی مەدەنی یەکینەدەگرتەوە .گۆردن مارشال لە ل١٠١ ی کتێبی قامووسی سۆسیۆلۆژی دەنووسێت: " لیبرالیەکان ئاماژە بە گرینگی پارتی سیاسی لە دیموکراسیەتی نیابی دەکەن , هەرچی مارکسیە نوێیەکانن ئەو ڕۆڵە کەمدەکەنەوە , ئەوان دەڵێن هەتا هێزی ئابووری دەستڕۆیشتوو لە کۆمەڵگای سەرمایەداری چینی دەسەڵاتدار بن , ئەوا سیاسەتی پەرلەمانی تەنیا بە وەهمێکی فریودەر دەمێنێتەوە!" کورد هەتا ١٩٩٢ لە کۆمەڵگایەکی نیوەفیودالی دەژیا , پارتی سیاسی زۆربە چەپی مارکسی بوون , بۆیە تەمەنی پەرلەمانی کوردی تەنیا دوو ساڵ بوو ١٩٩٢-١٩٩٤ .

پاش ئەوەی کۆمەڵگەی کوردی بەرەو سەرمایەداری چوو , پێشینەی چەپبوون بووە شەرم بوون و بێ دەسەڵاتبوون , ئینتمایەکی سەرمایەداری لای حیزبی دەسەڵاتدار دروست بوو , کە لە سەر ئابووری و دەسەڵاتی سیاسی دامەزراوە.

## ونبوونی ئینتیمای نەتەوەیی لای تاکی ئیسلامی!

لەم هاوکێشەی فیودالی و سەرمایەداری پارتی سیاسی کوردی , تەیاری ئیسلامی گۆرانکاریەکی رەگ و ریشەیی لێدروست بوو , ئەویش دەرگا کردنەوەیە لە دۆزی کوردی و خۆ دوورخستنەوەیە لە حیزبی ئیسلامی هاوسێ!

لە چەند بواردا هەست بەو لاوازیەی ئینتیمای نەتەوەیی دەکرا, کە لە هەندێ بواردا گەیشتبۆوە کاڵبوونەوە :

کورد لە دوو حاڵەتدا زۆر قەرداری قورئانە , دەبوو ئیسلامی کورد ئەو دوو حاڵەتە باش بوروژێنێت , بەلآم ئەفسووس ئەوە لە گوتاری ئیسلامی کوردی غائیب بوو , دوو حاڵەتەکەش بریتین لە :

**یەکەم** , خودا داوای لە نووح کرد , کە کەشتیەکەی لە شوێنێکی موبارك –پیرۆز دابەزێنێت , دوای لەنگەرگرتنی کەشتیەکە لە چیای جودی –باکووری کوردستان , کوردستان بووە لانکی دووەمی مرۆڤایەتی .

**دووەم** , رزگارکردنی کوردستان لە چنگی ساسانی و رۆمانی .

جگە لە غائیببوونی ئەو دووە لە گوتاری ئیسلامی کوردیدا , ئەوا لەم بوارانەشدا تا رادەیەك بێدەنگ بوون :

۱. **هەڵە حاڵیبوون :**

لە چەمکی ( زمان-جیایی و نەتەوە-جیایی ) قورئان زمان جیایی و نەتەوە لە یەکتر جیاکانی یەکلاکردۆتەوە , کەواتە قورئانی ئیلاهی چارەنووسی نەتەوەکانی یەکلاکردۆتەوە , بەلآم ئەوە

مرۆڤەكانن نەتەوەی سەردەستە و نەتەوەی ژێردەستەیان لە ناو موسڵمانان داتاشیوە .

۲. **لە بواری زمان :**

زمانی كوردی وەك زمانی فارسی و زمانی توركی زمانە .ئەوە دەسەڵاتی سیاسیە پایە و مەنزڵ بۆ زمان دیاریدەكات , نەك دین. قورئان لە سورەتی ئیبراهیم بە ڕاشكاوی باسی ئەوە دەكات , زمانی كوردی وەك زمانی هەموو نەتەوەكان پەیامی خودای پێ دابەزیوە هەروەها زمانی پێغەمبەرەكەیان بووە !

۳. **لە بواری پۆشاك :**

شەرواڵی كوردی بە قسەی د.فائیزی مەلا بەكر و كتێبی ( كورد لە فەرهەنگی شیعەدا ) ئامازە بەوە دەكەن , كە پێغەمبەر لە فەرموودەیەكدا پەسندی شەرواڵی كوردی دەكات .سیرە لەوبارەوەش پەسندی كەلتووری كوردی دەكات , كەچی بەشێك لە حیزبی ئیسلامی پەسندی جڵداشە ( كەلتووری عەرەبی كەنداو ) دەكەن.

هەڵگری ئەو پاشخانە ئیلاهیە , خاك و پۆشاك , لە نێو گوتاری ئیسلامی تەواو كاری لە سەر نەكراوە . كوردستان لای خودا خاكێكی موبارەكە هەروەها لای پێغەمبەر شەرواڵی كوردی شەرواڵێكی پەسەندی شەرعیە . ئەو دووە لای كوردی ئیسلامی غائیبە هەروەك چۆن كۆنفیدرالی ئیسلامی لای هەمان گروە غائیبە . لە دیدارێكدا لەگەڵ عەلی باپیر دا , بەڕێزی گوتی : " نیزامی ویلایاتی ئیسلامی زۆر بەرفرەترە لە فیدرالی كوردی , هەتا پرانسیپەكانی نزیكترن لە كۆنفیدرالی نەك فیدرالی ." ئەفسووس چۆن بەدرخانیەكان بە ناوی داهێنانی ئەلفبێی لاتینی لەگەڵ تورك ون بوون و هەمان شوناسی هاولاتی توركیان هەڵگرت ,

فەرامۆشکردنی نیزامی ویلایات ( کۆنفیدرالی ئیسلامی ) لای حیزبی ئیسلامی لە ١٩٩٢-٢٠٠٣ خەریك بوو شوناسی ئیسلامی کوردی ون بکەن و لە نێو دروشمی حیزبی عەلمانی بتاوێنەوە!

ئەو هەموو غائیبوونە دوورکەوتنەوە لە گوتاری قورئان و نزیکبوونەوەیە لە توراسی ئیسلامی کە بە قەڵەمی ئیسلامی غەیرە کورد نووسرایەتەوە . دەق بە ڕاشکاوی کار لە سەر یەکگرتنی نەتەوەکان دەکات , کەچی مێژوو قسە لە سەر پەرتەوازەیی نەتەوەکان دەکات .

تا کورد لە دەق نزیك نەبیتەوە و خۆی تێدا نەبینێتەوە هەروەها دوور نەکەوێتەوە لەو مێژووە , پەرتەوازەیی بەشێك لە ژیانی دەبێت . لەو دەقەدا ئاماژە بە پیرۆزی کوردستان کراوە هەروەها هەر ئیسلام بوو کوردی لە دوو پارچەیی ڕزگار کرد . لەو مێژووەدا , کە زۆربەی بەرهەمی عەقڵی دوور لە دەقە کورد زەندیقە , مەوالیە , خەواریجە , ڕۆڵەی ناشەرعی جنۆکەیە هەر جنۆکەیە..................!

# بەشی چوارەم
# چەند بابەتێکی پراکتیکی نێو دەق و مێژوو

گرینگە ئەم ڕاستیە هەژمبکرێ :

## یەکەم : ئیسلام لە سەدا ٢٠٪ ی بۆ تقووسی پەرستنی نێو مزگەوتە لە سەدا ٨٠٪ی بۆ پەیوەندی دەرمووەی مزگەوتە

لە نێوان ١٦ -٣٠ کۆچیدا زۆربەی کورد بوونە بەشێك لە خیلافەتی ئیسلامی , بە واتای تێکەڵ بوونی کورد بە ئیسلام بەرەو پازدە سەدەی قەمەری دەچێت . ئەم ساڵ , ساڵی ١٤٣٦ کۆچی قەمەریە , بە واتای زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵە بە پرانسیپەکانی ئیسلام ئاشنایە .

پاش ئەو هەموو مێژووە , کورد زیاتر تێگەیشتنێکی ڕۆحی بۆ ئیسلام هەبووە , بۆیە لە سەدەی نۆزدە و بیستەوە بە دیدێکی مەزهەبی بەشداری کردووە لە شۆڕشەکانی کورد , بە واتای ئەزموونی بەشداری عوبێدەڵلا و بەدرخان و شێخ سەعیدی پیران و سەید ڕەزای دەرسیمی و شێخ مەحموود بەشداریەکی مەزهەبی تەریقەتی بوو , نەك ئیسلامی (سیاسی ).

دیـدی رۆحـی چوارچـێوه و لـه قاڵبـدان بـۆ پرانسـیپەکانی ئیسـلام دروستدهکات و عەلمانیەتێك له ئیسلام دروستدهکات, ئەم دیاردەیە دیـاردەی " ئیسلام پەیوەندیەکی کەسیە لە نێوان خودا و تاك " لای تـاکی سیکیولەر دروستکردووه .

پەیوەندی رۆحی و غەیبی تاك بە زاتی خـوداوه لـه پێگیریکـردن بـه تقووسـه پەرستشـەکان کورتدەکرێتـەوه , کەواتـه گوتـاری قورئـان بـۆ تـاك پانتایـەکی کـەم لـه کـاتی تـاك داگیردەکـات . هـەموو خـاکی خـوا بـۆ تـاکی موسلمان مزگەوتـه .مزگـەوت بـۆ تـاك ناوەنـدی پەرستشـی تـاك بـۆ خـودا و کاروباری وڵات ( مامەلەی تاك لەگەڵ تاك ) دەگەیەنێت.

ئیسـلام بــه جیــاوازی زەردەشــتی و جــوویی و مەسـیحی...هەموو شـوێنێکی خـاوێنی کردۆتـه مزگەوت.ئـەو ناوەنـدە پـیرۆزە لای تـاکی کـورد کورتکراوەتەوه لە شوێنەکانی پەرستش لەوانە مزگـەوت .لەوانەیـه هـەردوو مەزهـەبی قـادری و نەقشـەبەندی ئـەو دیـاردەی دروسـتکردبێت , هەربۆیـه دیـاردەی " حیزبـی ئیسلامی " درەنـگ لـه نێـو کوردا دروسـتبووبێت , بـه جۆرێك پاش زیاتر لە ٢٠ ساڵیی , حیزبی ئیسلامی لە چاو حیزبە عەلمانیە قەبەکاندا , کەمینەیە.

ئـەو دیتنـه رۆحیـه بـۆ ئیسـلام , چـالاکی ئیسـلامی لـه کۆمـەڵگای کوردیدا پاسیف کردووه.

ئەگـەر مزگـەوت تایبـەت بێـت بـه نوێـژ و رۆژوو و تازیـه..., ئـەوا مزگەوت لە سەدا بیستی ئیسلام پێکدەهێنێت .هـەروەها ئەگـەر ئـەوەی لـه

مزگەوت بە دروستی جێبەجێ بکرێت , ئەوا کاریگەری لە سەر سەدا هەشتایەکەی دەرەوەی مزگەوت دەبێت.

لەم هاوکێشەیەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی ئیسلام پانتایەکی مەزن لە پەیوەندی تاک بە تاک دروستدەکات , تەنیا هەر چارەگێکی تایبەتە بە پەرستشی عیبادی نێوان خودا و تاک.

تەریقەت و حیزبیەت سەدا هەشتاکەی ئیسلامی بزرکردووە , سەدا بیستەکەی بە ڕواڵەت هێشتۆتەوە , بۆیە زۆر حاجی و دەروێش و ڕیشدار تەنیا لە مزگەوت موسلمانی دروست و تەندروستن , بەڵام لە دوکان و بازار و مامەڵەی مادیدا هێمای قرچۆکی و قۆڵبڕی و فێڵبازین . ئەو دیاردەیە لە تەمسیلی کوردی زۆر بە قەبەیی تەوزیف کراوەئایا ئیسلامە ئەمەیە؟؟!!

لە ڕوانگەی قورئان موسلمانی دروست لە مزگەوت و دەرەوەی مزگەوت وەك یەك وایە , چونکە هەموو خاکێکی خاوین مزگەوتە.هەبوونی ئەو مەزهەبیەتە لە کۆمەڵگای کوردیدا , ئیسلامی وەك شەریعەتێك لە مزگەوتدا قەتیس کردووە . هەردوو ئەزموونی سیرە و ڕاشیدین , پانتایەکی ڕاستەوخۆی زۆر کەمی داوە بە پەیوەندی خودا و تاك , بەڵکو زیاتر ئەو پەیوەندیەی بەرجەستەکردووە لە پەیوەندی تاك بە تاك !

دوورکەوتنەوە لە سیۆلۆژی مەسیحیەت و وردبوونەوە لە زاتی خودا , بەزانىنی گوتاری قورئانە هەروەها هەوڵدانێکی ڕەنجبەساریە , چونکە نەك لە واقیع, بەڵکو زاکیرەی تاکدا وێنەی خودا نادۆزیەوە , خودا لە قورئانیش فەرموویەتی ( هاوشێوەی ئەو-خودا- نییە ), بەڵکو هەژموونی

خودا له سەر تاك له پەیوەندیه جڤاكیەكانی مرۆڤ لەگەڵ یەك دەدۆزیەوە

ئەوە كەلتووره وێنەی خودای لا ونكردووین , خودا تەنیا له مزگەوت نییه , بەڵكو له پەیوەندییە جڤاكیەكانە , گەر باوەڕ ناكەی قورئان بخوێنەوە , نەك كەلتوور و مێژووی " نوێژ به ڕێی خۆی, ئەمەش به ڕێی خۆی ."

## دووەم : برایەتی ئیسلامی لە نێوان کێشە و چارەسەردا

هەر سێ دەسەلآتی نەتەوەی دەوروبەر هەرگیز بە پێوەری هیچ فەرموودەیەك كار ناكەن , چونكە ئەو دەسەلآتانە زادەی ناسیۆنالیزمی نەتەوەیی و مەزهەبین , نەك پرانسیپەكانی قورئان .

لە نێوان ئێمەی كورد و هاوسێكانمان لە نێو هەژموونی ناسیۆنالیزم و ماركسیزم دا هیچ برایەتیەكی ئیسلامی نەماوە , بەلآم كورد پێگیری بەو برایەتیە كردووە , ئەوانیش وەك زادەی ناسیۆنالیزم , هەر بە یەكجاری ئەو برایەتیەیان ترۆ كردووە , هەتا گەورەترین باجی داوە : ئەو باجەش باجی كوردبوون بووە , جا تۆ موسڵمان بی , شەبەك بی , فەیلی بی , یا كاكەیی و ئێزیدی بی وەبەر شالآوی داگیركار كەوتوویی !

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین خوێندنەوەیەكی دروستی ئیسلامی بۆ برایەتی ئیسلامی بكەین هەروەها پرسی بەنگەلادیش –پاكستان بكەینە پێوەر بۆ ژیان لەگەڵ تورك و فارس و عەرەب .... ئەوە چ برایەتیەكە ئەوان ئاغا و خاوەن دەوڵەت بن , ئێمەی كورد كرمانج و گەدا بین؟؟

## باكگراوەندی مەسەلەكە لای بەندە

بەرلەوەی لەم دیاردەیەی جیابوونەوەی كیانێكی موسڵمان لە دەوڵەتێكی ئیسلامی بدوێین , بزانین ئەو برایەتیە ئیسلامیە كێشەیە یان چارەسەر؟ , دەمەوێ سەرنجی خوێنەر بۆ چەند شتێك ڕابكێشم بكەم , وەك:

١. له ٢٠١٠ له (تەلەفزیۆنی نەورۆز) لەگەڵ (د.ڕەحیم سورخی) لە سەر سەربەخۆبوونی زمانی بەنگالی و نەتەوەی بەنگالی لە دەوڵەتی پاکستان له بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی پەخشنەکراو, قسەمان کرد!

٢. له شوباتی ٢٠١١ له ڕادیۆی زین –دا لە دیدارێکی ڕاستەوخۆ قسەم لە سەر ئەو جیابوونەوە زمانەوانی و نەتەوەیە کرد.

٣. له شوباتی ٢٠١٤دا له تەلەفزیۆنی ڕووداو لە بەرنامەی (نوو ڕۆژ) لەو مەسەلەیە دوام .

٤. لە شوباتی ٢٠١٤دا لە تەلەفزیۆنی سپێدە لە بەرنامەی (ئەمڕۆی سپێدە) لە سەر هۆی جیابوونەوەی بەنگالیم لە پاکستان لەگەڵ خوشکە ( ؟ ) تاوتوێکرد. ئەمساڵیش ٢٠١٥ له هەمان تەلەفزیۆن قسەم لەوبارەوە کرد!

٥. لە سیمینار و کتێبی زمانی زگماك –ی ئەکادیمیای کوردیدا , بەتوێژینەوەیەك لەو مەسەلەیە بەشدار بووم .

٦. له لاپەڕە ١١٩-١٢٤ ی ژمارە ٢٠٢ گۆڤاری ڕامان دا لە سەر ناسنامەی زمانی دایك لە بەنگال و پاکستان و هیندستان و کوردستان , وتارێکم بلاْوکردۆتەوە .

لەو دیدار و نووسینانە دەردەکەوێ , کە بەندە ٤ ساڵ بەر لە سیمینارەکەی پێشکچی قسەم لە سەر مەسەلەی جیابوونەوەی بەنگال لە پاکستان کردووە!

## هەندێ تێبینی لە سەر سیمیناری بێشکچی لە ئەکادیمیای کوردی

١. ئەو بێشکچیەی لە کۆتایی هەشتاکانەوە بە ناو و نووسینی ئاشنا بووم , لە سیمینارەکەی ئەکادیمیا نەمبینی , چونکە ئەو لە حەفتاکانەوە بە کورد ئاشنایە هەروەها لە سەر کورد و زمانی ئازاد ١٧ ساڵ لە زیندان بووە , چۆن دەبێت بە دینی زۆربەی کورد ئاشنا نەبێت ؟

٢. دیتنی ئەو بۆ ئیسلام وەك دیتنی ناسیۆنالی عەرەبی و فارسی بوو , کە ئەوان ئیسلام بە کەلتوور دەبینن , نەك وەك دینێکی ئیلاهی , کە جیاوازی لە نێوان نەتەوەکان ناکات .

٣. ئەو وتی :" برایەتی ئیسلامی ) بە زەرەری کوردی تەواو بووە ! مەسەلەکە پەیوەندی بە برایەتی ئیسلامی وەنییە , چونکە ستەمکار و داکۆکیکاری دۆزەکە بە پرانسیپی ئیسلام ئیش ناکەن , بەلکو بە پێوەری مێژوولی قەبەلی ئیش دەکەن .ئەوەی لەم هاوکێشەیەدا گرینگە شوناسی دۆزی کوردە , کە کوشتە و قوربانی رۆژئاوایە , بۆیە بۆتە یەتیمی نێودەڵەتی و لۆکالی دەوڵەتی قەومی سیکیولەری تورك و عەرەب و فارس!

برایەتی ئیسلامی لە نێوان کورد و ئەو نەتەوانە لە پاش نەمانی دوا خەلافەی عوسمانی نەماوە و بۆتە پەیوەندی داگیرکراو و داگیرکەر ! لە نێو خودی نەتەوەی موسلمانانیشدا , داگیرکەر و داگیرکەر نییە , بۆیە ئیسلام لەو پەیوەندیە بەریە , ئەو پەیوەندیە داهێنەری دەوڵەتی عەلمانی قەومیە!

## خودی کێشەی بنگالی - پاکستانی

کێشـــوەری هیندســـتانی گـــەورە لانکـــەی ئایینـــە ئاسمـــانی و نـــا-ئاسمانییەکانـــە .موســـلمانەکانی ئـــەو کێشـــوەرە دەیانویســـت دەوڵـــەتێکی ئیسلامیان هەبێت بۆ ئەوەی لە هیندۆسەکان جیاببنەوە , ئەوەبوو لـە ئـابی ١٩٤٧ دوو دەوڵـــەتی پاکســـتانی و هیندۆســـی لـــە دوو ڕۆژی جیـــاوازدا لـــە کۆمنوێلسی بەریتانی جیابوونەوە .

ئەوسـا دەوڵـەتی پاکسـتانی بـریتی بـوو لـە پاکسـتان و بـەنگال وەك کیانێکی ئیسلامی لە کۆمنوێلس و هیند جیابوونەوە . زمانی ئـوردو ئەوسـا زمانی نووسینی موسلمانەکانی کێشوەری هیند بوو,کەواتە ئوردو شوناسێکی ئیسلامی وەرگرتبوو, نەك قەومی و دەڤەریی . لە پاکستاندا زۆر زمـانی دی هەبوون , لەو نێـوە پاکسـتانیەکان زمـانی ئوردویـان کـردە زمـانێکی قـەومی یان نەتەوەی سەردەست هەروەها زمانی بەنگالیان لە ڕۆژهـەلاتی پاکسـتاندا لـە پـەروەردە و کاروبـاری دەڤەرەکـە دوور خسـتەوە . لـەو نێـوە سـتەم لـە قـــەومی بـــەنگالی کـــرا , بۆیـــە لـــە شـــوباتی ١٩٥١ دا بـــە خۆپیشـــاندانێکی زمانەوانیدا , داوای سەربەخۆیی زمانی بەنگالیان کرد .بیست ساڵ پاش ئەو ڕوداوە , بەنگال وەك ولاتێکی دی موسلمان لە پاکستان جیابۆوە .

## شوناسی دۆزەکە

ڕاستە بەنگالیەکان بە خوێن لە پاکستان جیابوونەوە هەروەها شۆڤینیەتی پاکستانی و هەژموونی ئۆردوویی ڕۆڵی خۆی هەبوو , بەلاّم ئەو جیابوونەوەیە بە بەرژەوەندی هیندۆسیەکانی هیندستان تەواو بوو , چونکە بەو جیابوونەوەیە درز و شەقار کەوتە ناو موسلمانەکانی پاکستان.

لە کاتی جیابوونەوەی پاکستان ( پاکستان + بەنگەلادیش ) لە هیند , زیاتر لە ١٠٪ تاکی هیندۆسی وەبەر ئەو دەوڵەتە ئیسلامیە کەوتن , زیاتر لە ٨٠٪ی ئەو هیندۆسانە لە دەڤەری بەنگالی بوون , بۆیە هیندی هیندۆسی و ئیسرائیلی جوولەکە دەوریان لەو جیابوونەوە هەبوو ! بەمجۆرە یەکێتی ئیسلامی لە بەرامبەر یەکێتی هیندۆسی هیند و بەنگلادیش هەڵوەشایەوە و بووە دوو. کەواتە دروستبوونی بەنگلادیش لە ئەنجامی ستەمی پاکستان و موئامەرەی هیندۆس دروستبوو!

## پەیوەندی ئەو جیابوونەوە بە دۆزی كوردەوە

جیابوونەوەی بەنگلادیش لە پاكستان جیاوازە لە دۆزی كوردیەوە , تەنیا لە دوو خاڵدا بەیەك دەچن :

١. ستەمی دەوڵەتی پاكستان لە نەتەوە و زمانی بنگالی

٢. جیابوونەوەی نەتەوەیەكی موسلمان لە دەوڵەتێكی موسلمان ,

پاكستانی و بەنگالی وەك یەكەیەكی سیاسی و یەك دینی لە ساڵی ١٩٤٧ لە كۆمنوێلس و هیند جیابۆوە .پاكستانی و بەنگالی پێكهێنەری دەوڵەتی پاكستانی بوون . هەر پێنج بەشی كوردستان قوربانی چەند رێككەوتنێكی وەك توركمانچای , سان ستانیفۆ , سایكس –بیكۆ , برێست لیتۆفسك , لۆزان ...بوو , كە لە هیچیاندا خۆی بكەری دابەشكەری ولآتی خۆی نەبووە . لەو نێوەدا زلهێزەكانی ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوا و تورك و فارس و عەرەبی عەلمانی دەوریان لە دابەشكردنی ولآتی كوردان هەبوو هەروەها لەمەدا برایەتی ئیسلامی لە تەرەف تورك و فارس و عەرەبەوە غائیب بوو . لە لایەكی دی دۆزی كورد وەك بەنگالی لە سەر بنیاتی جیابوونەوە دروستنەبووە , بەڵكو ئەوە نەتەوەكانی هاوسێی كوردن , بە پاڵپشتی رۆژئاوا هەر یەكە بەشێكی كوردستانی بۆ خۆی بردووە , بۆیە خەباتی كورد بۆ گەڕاندنەوەی ئەو خاكانەی خۆیەتی , نەك جیابوونەوە لە یەكێتی ئیسلامی , بەڵكو ئەوە توركی عەلمانی و عەرەبی عەلمانی بوون لەگەڵ ئینگلیز و فەرەنسا بەشداربوون لە لەت لەتكردنی یەكێتی ئیسلامی!

پاش ناساندنی هەردوو كێشەكە هۆكار لە دروستبوونیاندا , گرینگە ئاماژە بە شوناسی دۆزەكە بكەین .

هەرچۆنێك بێ بەنگالی بۆتە هەڵوەشاندنەوەی یەكێتی ئیسلامی لە هەمبەر هیندۆسدا , بەلاّم لە دۆزی كورددا كورد و خاكەكەی بكەر نیین , بەڵكو بەركارن .ئەو نەتەوانەی بكەریشن , تەواو برایەتی ئیسلامیان توورِ هەڵدا , ئینجا دۆزەكە دروستبوو .لەو بارەیەوە محەمەد زەكی مێژوونووس دەگێرِێتەوە تا تورك و عەرەب لە نێو دەوڵەتی عوسمانی نەیانگوت ئێمە توركین یان عەرەبین , ئێمە نەمانگوت ئێمە كوردین , بەڵكو هەر دەمانگوت عوسمانیین . برایەتی ئیسلامی لە نەزەر بێشكچی كوردستانی كردۆتە ناوەندی دۆزەخێك كە چواردەوری نەیارەكانیەتی ." هەروەها وتی :" چارەنووسی دۆزی كورد بەستراوەتەوە بە دەوڵەتی " ئیسلامی " دكتاتۆرەوە ." لە وەلاّمدا دەڵێم لە پاش هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی لە ١٩٠٨ , ( برایەتی ئیسلامی ) لە نێوان كورد و دەسەلاّتی توركەوە نەما هەروەها ئەم دەسەلاّتە توركیە بۆ ماوەی هەشتا ساڵ ١٩٢١-٢٠٠١ ویستی ناسنامەی ئیسلامی و ناسنامەی قەومی باكووری كوردستان بسرِێتەوە هەروەها دەسەلاّتی ئیرانی لە ١٩٢٥ هەتا ئێستا خەریكی بە شیعەكردن و سرِینەوەی ناسنامەی كوردیە لە رۆژهەلاّتی كوردستاندا  لەولاوەش دەسەلاّتی عەرەبی لە عیراق و سوریا ( بە تایبەتی سەردەمی كۆماری ) هەتا پێی كرابێ شەرِی ئیسلام و كوردی بە كەرەسەی ئیسلامی دەوڵەتەوە كردووە. كەواتە كێشە لە برایەتی ئیسلامی نییە , بەڵكو لە ونبوونی برایەتی ئیسلامی هەقیقیە هەروەها كێشە لە ناسنامەی ئەو دەوڵەتانەیە , كە بە قەد دووری ئاسمان لە پرانسیپەكانی ئیسلام دوورن , بۆیە كورد لە خاكی خۆی ئامۆ و كۆیلەیە بە دەست دەسەلاّتی عەلمانی تورك و فارس و عەرەب !

پاش ئەوەی سەلماندمان ئەوە کورد نییە پشتی لە برایەتی ئیسلامی کردووە , بەڵکو ئەوە تورك و عەرەبە پشتی لە برایەتی ئیسلامی کردووە .

کێشەی بنەڕەتی دۆزی کورد و فەلەستینی , موسلمانبوونە . ئەوەتە لە کارنامەی یوئێندا دەقێك هەیە :" کە لە پێناو پاراستنی دیموکراسی دا ئەنجومەن دەتوانێت بە جواب بێت ..." لە سەر ئەو بنەمایە لە سەر کودەتای ١٩٩٤ لە ئەفریقیا بە جواب هات , هەتا سەرۆکی هەڵبژێردراوی گەڕاندەوە دەسەلات , بەلام لە کودەتای سیسیدا بێدەنگی هەڵبژارد! بە کورتی جیاوازیەکە لەوەدا بوو ئەو دەوڵەتە ئەفریقیە مەسیحی بوو , دەوڵەتی مورسی دەوڵەتێکی ئیسلامی بوو !

جۆرە سیستەمێکی ئاغا –کرمانج لە ناوچەکە هەیە , ڕۆژئاوا وەك ئاغایەك وا لەو دەوڵەتە عەلمانیانەی ڕۆژهەلاتی ناوین وەك عیراق و سوریا و ئیسرائیل ...وەك کرمانجێك دەکات , کە کێشەی نەتەوە موسلمانەکان چارەسەر نەکەن؟باشترین نموونە سەربەخۆیی ئابووری باشووری کوردستانە , کە هەنگاوێکی گرینگە بۆ دەوڵەتبوون , کەچی ئەمریکا بە ئاشکرا نارەزایی لە سەر ئەو هەوڵەی کورد دەردەبڕێت ! کەچی گوێی مالیکی ڕاناکێشێت لە سەر بڕینی مووچەی کورد!

هەر گوشاری ڕۆژئاوا بوو وای لە ئەندەنووسیا کرد دان بنێت بە سەربەخۆیی تەیموری ڕۆژهەلات هەروەها وای لە سودان کرد دان بنێت بە باشووری سودان ! دەپرسم کێشەی تەیمور و باشووری سودان لە کێشەی کورد و فەلەستین گرینگترن ؟ هەرگیز نا , مەسەلەکە هەر ئەوەندەیە زۆربەی خەڵکی تەیموری ڕۆژهەلات و باشووری سودان , موسلمان نیین!!!

کەواتە مامۆستا بێشکچی برایەتی ئیسلامی کێشە نییە , بەڵکو چارەسەرییە ! ئەوەی کێشەیە ونبوونی ئەو برایەتیە ئیمانیە , کە برایەتی قەومی دەتوێنێتەوە , بەلام ئەفسووس لای قەومیانی تورك و فارس و عەرەب برایەتی ئایدیۆلۆژی و حیزبی و قەومی جێی برایەتی ئیمانی گرتۆتەوە , بۆیە جیاوازی ئەو نەتەوانە لەگەڵ کورد تەنیا ڕواڵەتیە و زۆربە کۆیلەی دەسەلاتن لە نێو دەوڵەتی قەومیدا یان ڕێکتر دەوڵەتی سایکس بیکۆدا!!

## چارەسەری دۆزی کورد لە سەر بنەمای بەنگالی –پاکستانی

کێشەی زمان جیاوازی و نەتەوە جیاوازی دوو ئایەتی خوای گەورەن , هەروەها مەبەست لە هەبوونی نەتەوەی جیاواز , یەکتر ناسینە , نەك چەوساندنەوەی نەتەوەی بەرامبەر . پەسەندی تاك و نەتەوەیەك لای خودا بە پێوەری تەقوا دەپیورێت .لە نێو ئەم پێوەرەش " چیت بۆخۆت پێ خۆشە , دەبێت بۆ براکەت پێتخۆش بێت ." هەروەها " تاعەتی هیچ کەس و دەوڵەتێك وەرناگیرێ لە یاخیبوون لە فەرمانی خوداییدا "

هەر کیانێك کە لە دوای ١٩٠٨ دروستبووە بەرهەمی ناسیۆنالیزم و کۆمۆنۆنیستی و نەتەوەپەسەندی ...بووە , بۆیە یاخیبوون لە فەرمانی خودا بەرجەستەبووە لە گوفتار و ڕەفتاری نەتەوەی سەردەست , کەواتە حوکمڕانی ئیسلام لە هیچ دەوڵەتێکدا نامادەگی نییە , ئەوەی هەیە نەتەوەپەسەندیە .نازانم زمانی ئۆردو , زمانی بەنگالی , زمانی فارسی ,

زمانی تورکی .....چ قودسیەکی ئیلاهیان هەیە ؟ ئەو هەموو شەڕەی لە پێناودا کرا .

لە ساڵی ١٩١٨دا ویدرۆ ویلسن لە بەندی ١٢دا داوای سەربەخۆی گەلانی نێو دەوڵەتی عوسمانی کردووە , کوردیش یەکێك لەو گەلانەی نێو دەوڵەتی عوسمانی بووە , بە واتای پێش ٥٣ ساڵ لە بەنگالیەکان داوای سەربەخۆیی دەکرا , بەڵام پاش دامەزراندنی دەوڵەتی قەومی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین ١٩٢١-١٩٤٦ هەروەها بەرجەستەکردنی سایکس –بیکۆ و لۆزان , پێش جیابوونەوەی پاکستان , کورد بەسترایەوە بە کیانی عەلمانی تورکی و عەرەبی!

کەواتە کورد مێژوویێکی کۆنتری لە پاکستان و بەنگال هەیە , ئەوە ڕۆژئاوایە ناهێڵێت کورد لە کیانی عەلمانی تورکی و عەرەبی و فارسی جیابێتەوە , تەنیا بە مەرجی مێجەر نوئیل نەبێت " کە کورد ببنە مەسیحی !!"

کەواتە کورد بە هۆی دەرەوە نابێتە خاوەن دەوڵەت :

١. تا دەوڵەتە عەلمانیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین نەڕوخێن ,
٢. کورد نەبێتە مەسیحی-کریسچیانی ,
٣. چاوی لە چارەسەری ڕۆژئاوا بێت .

هەرسێ هۆ ئەگەر مەحاڵ نەبێت ئەستەمە , کەواتە دەبێت لە چارەسەری کوردی بگەڕێین و بە کورتی واز لە پەرتەوازەیی و حیزبیەت بێنین و خۆمان یەکلابکەینەوە لەگەڵ دەسەڵاتی عەرەبی و تورکی و فارسی.

پاش بێئومێد بوون لە ئەمریکا , چۆن لە ١٩٧٥ بێئومێدی کردین , لە رۆژنامەی هەولێر ژمارەی ٢ حوزەیرانی ٢٠١٤, وتارێکی بڵاوکراوەتەوە و تێیدا هاتووە:" چارەسەرکردنی گرفتەکانی نێوان هەرێم و بەغدا ئەستەمە پێناچێ هەرگیز چارەسەر بکرێن ,...بۆیە تەنیا چارەسەر جیابوونەوەی هەرێمە لە عێراق"

کورد لەگەڵ دەوڵەتی رۆژئاوایی و دەوڵەتی داگیرکاری عەلمانی مێژوویێکی نزیکە سەد ساڵی هەیە و ئەو مێژووە هەر بۆ خاپاندنی کورد بووە , بۆیە کورد پێویستە وەك بەنگالی لە رووی خەبات و لینکەوە لە تورکیا و ئیران و عیراق و سوریا جیابێتەوە , چونکە ئەو دەوڵەتە قەومیانە پێچەوانەی دوو فەرموودەی خوا و پێغەمبەرن :

أ . لە سەر ستەم دامەزراون , نەك برایەتی ئیسلامی – ئەگەر کورد و ئەوان موسلمان بن , بران , بەلآم ئەوان دەڵێن ئەوەی خۆمان بۆ خۆمان , خاکی کوردیشمان دەوێت.

ب. بۆ خۆیان دەوڵەتیان پێخۆشە , بۆ کوردیان پێخۆش نیە.

هەروەها هەتا چیتر کورد پشتی بە ئەمریکا گەرم نەبێت , چونکە ئەمریکا لە سەر بەرژەوەندی دروستبووە , کوردی باشوور ئەوە دە ساڵە هاوپەیمانی ستراتیژی ئەمریکان , ئەمەش پێچەوانەی چەندان ئایەتی قورئانە , کە موسلمانان ئاگادار دەکاتەوە , کە دەوڵەتی وەك ئەمریکا بە هاناتان نایەت :

١. هەتا پەیرەوی میللەتەکانیان نەکەن ( دینی خۆتان نەگۆڕن ),

٢. ببنـه پاڵپشـت , کـورد ئـەوە نزیکـەی سـەدەیەکە پاڵپشـتی ڕۆژئاوایـە, کەچی بەریتانیا و سۆڤیەت و ئەمریکا لە چەندان دەرفەت دژی کورد بووینـە , ئێسـتاش ئـەمریکا پـاش ٢٣ سـاڵ لـە هاوپـەیمانی وەك بەریتانیای بیستەکان , فائق بێکەس وتەنی پاش ٢٧ خزمـەت , ئـەمڕۆ لە پێناو شیعەی بکوژی چەندان مارینزی ئـەمریکی , ئـەوە خەریکە پشـت لـە کـورد دەکـات و بـە ئاشـکرا دەبێتـە بەربەسـت لـە پـێش سەربەخۆیی ئابووری کوردی باشوور , لە لایەکی دیش چۆن بـەریتانیا لـە بیسـتەکان ئێمـەی کـوردی باشـووری بـە دەسـەڵاتی عـەلمانی عەرەبیـەوە لکانـد , ئـەمریکاش بەربەسـتی زۆر لـە بـەردەم کـورد دروستدەکات هەتا لەو لکاندنەوە جیانەبێتەوە!

کۆتا قسەم ئەوەیە , دکتۆر بێشکچی برایەتی ئیسلامی کێشە نییە لە بـەردەم چارەسـەری دۆزی کـورد , بـەڵکو پاڵپشـتیکردنی ڕۆژئاوایـە , ئـەو ماڵوێرانیەی بە سەر کورد هێنـاوە بـە دەسـت دەسـەڵاتی تـورکی و فارسـی و عەرەبی !

برایی ئیمانیی کرۆکی گوتاری قورئانـە , مـن ئاغـا و ئەویـدی گـەدا , بەرهەمی مێژووە , زادەی ناسیۆنالیزمی شۆرشی فەرەنسایە!

دوورکەوتنەوەی کورد لە مێژوو و نزیکبوونەوەی لە دەق , داهاتوویێکی پرشـنگداری شوناسـداری بـۆ دروسـت دەکـات . گـەر بـاوەڕ ناکـەی قورئـان بخوێنەوە!

## سێیەم : کورد یەتیمی لۆکالی و نێودەوڵەتی

من لەو ڕایەی خۆم کە لە نۆوەدەکان لە کتێبی سێکوچکەی هەرەس خستۆمەتە ڕوو پەشیمان نیم , کە رۆژئاوا و ئەمریکا کوچکەیەکن لە هەرەسی هەموو هەوڵێکی کوردی ! کاتێ من ئەو قسانەم لە رۆژنامەی ڕابوون لەگەڵ برای دووره ولآت موحەمەد هەریری دەکرد , هاولآتی و ئاوێنە و لڤین و روداو و میدیا و باس هەر بوونیان نەبوو!

لەو ڕوانگەی مێژووەوە رۆژئاوا و ئەمریکا قەبر بۆ کورد هەڵدەکەنن , چۆن لە نۆوەدەکان گۆرباتچۆڤ قەبری بۆ ئەفسانەی مارکسی و مانفێستەکەی هەڵدەکەنی!کەواتە چاوەڕێی رۆژی خۆش لەو دووە مەبن , ئەوان بۆ ئێمە نابنە باوك هەر بە یەتیمی دەمینێنەوە!ئەوە ئەمریکا لە ٦ی سێی ١٩٧٥ شۆرشی کوردیان بە چەند بەرژەوەندیەك فرۆشتە ناسیۆنالیستی عەرەبی لە عیراق, لە ٢٩ی یازدەی ١٩٧٩ دێنەوە , کورد بە یەتیمی نێودەوڵەتی ناوزەددەکەن!! دەزانن بۆ لەو کاتە وەجواب هاتن , چونکە چەند مانگێك بوو , گەلانی ئیران پادشاکەی ئیران –کە گەدای ئەمریکابوو لە ناوچەکەدا-روخاندبوو!!

ئەوەی مەندەهۆشی کردووم هەڵوێستی تاکی دینداری هەر سێ نەتەوەی تورك و فارس و عەرەبە!دەربارەی عەلمانیەکانی ئەو سێ نەتەوەیە هیچ ناڵێم , کە بەو هەموو ملیۆنە تاك تاك بوونیان هەیە و قسەیەکی خێر بۆ کورد دەکەن.

موسلمانەکانی ئەو سێ نەتەوەیە , کورد بەوە تاوانبار دەکەن کە کورد حیزبی مارکسی و کۆمۆنیستی هەیە , بۆیە بە هانای کورد نایەن .ئەو هەڵوێستە مایەی پێکەنینە , چونکە لە نێو عەلمانیەکانی نەتەوەی ئەوان شیوعیەت و مارکسی جمەی دێ !! ئاخر زۆربەی سەرکردە عەرەبەکان

سیسی و قەزافی و بەشار و موبارەك ئاسا نین , كە هەتا سەر ئێسكان دژی بەرنامەی خودان!! خودا هەمان هەڵوێستی هەیە دەربارەی ماركسی توركی عەرەبی فارسی كوردی....., هەرگیزا و هەرگیز وەك ئێوە نییە.ئەو سنورەی كوردی بە تورك و عەرەب بەستۆتەوە دەرهاویشتەی سایكس-بیكۆیە , و هەرگیز پیرۆز نییە , بەلام ئەو سنورەی كوردی بە فارس بەستۆتەوە , گەمژەیی كوردە , كەحیزبی كوردی رۆژهەلات باوەڕی بەوە كردووە فارس ئامۆزای كوردن!! ئەوە چ ئامۆزاییكە , فارس پادشا بێ , كورد گەدا بێ!

قورئان لە چەندین دەقدا ئێمەی كورد لەگەڵ ئێوەی تورك و عەرەب و فارس بە برای ئیمانی ناودەبات , ئەوە سەدەمیەكە ئێوە بە هەموو چەكێك شەڕی ئێمە بە فیتی رۆژئاوا و ئەمریكا دەكەن , ئەو ئایاتانەی قورئان كارتان لێ ناكات!!

بە ڕاستی ئێوە لە بەرد دڵرەقترن , چونكە ئەو دەقە ئیلاهیانە ناتانبزوێنێت!

نەتەوەیەك چ كاری بە ئایدیۆلۆژیای چەند حیزبێكەوە وەیە؟؟ ئێوە ئیشتان لەگەڵ نەتەوەیەكە , نەك حیزبێكی مەنهەج بقە!

ئێمە تاكە نەتەوەیەن لە رۆژهەلاتی ناوین , كە بێ دەوڵەتین-ئەو بێ دەوڵەتیە یەتیمی كردووین , دەپرسم ئێمە یەتیمی نێودەوڵەتی نین؟؟!

لە قورئاندا من و ئەویدی وەك یەكین , نەك یەك سەرۆك و ئەویدی كەمینە .ئەو پێوەری زۆرینە و كەمینەیە بەرهەمی مێژووە , نەك قورئان . سیرە دەلێت : گەر تۆی عەرەب و تورك و فارس پێت خۆشە دەوڵەتت هەبێت , دەبێ پێت خۆش بێ كوردیش دەوڵەتی هەبێت , گەرنا هەزاران پرسیار لە باوەڕی خۆت بكە , چونكە باوەڕت ناكامڵ و نوقسانە با بەرماڵت لە ئاسمان بسوڕێتەوە , گەر هەر باوەڕیش ناكەی قورئان بخوێنەوە!

## چوارەم : ١٧ کورسی بێ قورسایی بەرانبەر ١٨ کورسی پڕ قورسایی!

پاش ئەوەی " کادیری حیزبی ئیسلامی " لە زاکیرەی تاکی کوردیدا جیاوازیەکی بنەڕەتی لەگەڵ حیزبی عەلمانی کوردی نییە , بۆیە ئەو فەشەلە وایکرد بانگەوازخوازی ئیسلامی نێو حیزبە ئیسلامیەکان دەوری سیاسیەکان ببینن .

حیزبی ئیسلامی " یەکگرتوو + کۆمەڵ + بزووتنەوە " نزیکەی نەوەندەی یەکێتی نیشتیمانی دەنگیان هێنابوو , بەلاّم هەندێ وەزارەتی مردوویان وەرگرت . ئەو فەشەلە وەیکرد , یەکگرتوو + کۆمەڵ بۆ پارێزگاکان لە لیستێك کۆببنەوە !!

سیاسەتکردنی سیاسەتمەداری ئیسلامی جیاوازیەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ سیاسەتمەدار عەلمانی کوردی. ئەزموونی ٢٠ ساڵی سیاسەتکردنی حیزبی ئیسلامی لە کۆمەڵگای کوردی نەیتوانی دەنگی حیزبی ئیسلامی لە ٢٠٪ تێپەڕێنێت , کەچی تەفگەرێکی وەك گۆڕان , کە بەشێکی زۆری کەرتێکی یەکێتی بوو , بە ماوەیەکی کەم تەنیا نزیکەی چارەگێك لە کورسیەکانی پەرلەمان ببات.

سیاسەتکردن و ئایدیۆلۆژی حیزبی ئیسلامی سەرچاوەی لە تێڕوانینی مرۆڤەوە گرتووە .هەردووك بەرهەمی حیزبیەتن , بۆیە بەرژەوەندی حیزب دەبێتە بەشێك لە پرۆگرامیان. بۆ بە ئەزموونکردن و بەرجەستەکردنی تێڕوانینی سەرەوە , حیزبی ئیسلامی کوردی ناچاربووە لە بانگەوازخوازی ئیسلامی نزیك بێتەوە.بانگەوازخوازی ئیسلامی لە

کایەی ئیسلامی دەرکەوتن و دەنگی زۆر زیاتریان لە سیاسەتمەداری ئیسلامی هێنا .

کەواتە ئایدیۆلۆژیا –گروپکاری و لەتکردنی جەستەی ئیسلام بۆ پەروەردە و ئیصلاح و پاشخان پەرگیری یان مەزهەبیەت و سەلەفیەت و ئیخوانیەت , ڕەوتی ئیسلامی سنووردار کرد .

له هەڵبژاردندا ئایدیۆلۆژیا و مێژووگەری و دەسەلاتداری دەورێکیان نییە , چونکە خودی هەڵبژاردن لە سەر دەنگ دروستدەبێت . چونکە حیزبی ئیسلامی مەحکومە بە گروپکاری و لەتکردنەوە گەورەترین غەدر له دەنگدەری ئیسلامی دەکات .

به حوکمی ئەوەی ئەم نوسینە تایبەتە بە ڕەنج خەساری حیزبیەت , ئاماژە بەوە دەکەین کە حیزبی ئیسلامی ئاوس بە ( گروپکاری ئایدیۆلۆژی ) و ( لەتکاری ) زیاتر خۆی بەرپرسیارە لە بچووککردنەوەی خودی خۆی !

لە هەڵبژاردنی ٢١ی سێپتێمبەری ٢٠١٣دا یەکێتی تووشی نسکۆیەکی گەورە بوو , بە جۆرێك لە ٥٠٪ ی ١٩٩٢ هاتە ١٨٪ , کەچی ڕەوتی ئیسلامی لە ٠٪ی ١٩٩٢ هاتە ١٧٪ ! لە دەنگ و پیادەکردندا پارادۆکسیەکی ترسناك هەیە : یەکێتی بە ١٪ دەنگی زیاتر لە ئیسلامیەکان , کەچی توانی :

- جێگری سەرۆکی هەرێم و حکومەت و (پەرلەمان )و

- پێنج وەزارەت بە دەستبێنی

کەچی بەهۆی گروپکاری و لەتکاری یەکگرتوو دوو وەزارەت ...و کۆمەڵ یەك وەزارەت و مدیریەت و بزوتنەوەی ئیسلامی هیچ وەزارەتێکی بەرنەکەوت!

هەروەها سەیرم بەوەدێت یەکگرتوو پێش پارتی و یەکێتی دژی ئەوەیە پۆستی سکرتێری پەرلەمان بۆ کۆمەڵ بێت , بۆیە چاوەڕێدەکرێت ئەو پۆستە لە کۆمەڵ بستێننەوە بۆ پارتی یان یەکێتی بێت!

بە ڕاستی کە سەلەفیەکانی بەر سپلیت ئەو جۆرە حیزبیەتەی ئیسلامیەکان دەبینن , ناهەقیان نییە دەڵێن :" حیزبی ئیسلامی بیدعەی سەردەمە !!"

لە کۆتایی دەڵێم ئەو جۆرە حیزبیکردنەی ئیسلامی خەتەری هەر لە سەر دۆزی کورد نییە ( بەوەی چارەنووسی ئەو دۆزە بۆ پارتە عەلمانیەکان بە جێدەهێڵێت ) , بەڵکو خەتەری لە سەر دەنگی تاکی ئیسلامیش لە کۆمەڵگای کوردیدا هەیە.

تازە حیزبی ئیسلامی بە خۆی هاتەوە لە حکومەتە محەلیەکان بوونە یەك لیست بە ناوی لیستی خزمەت , بەڵام لە پەرلەماندا هەر سێ لیستن!! قورئان دەبێژیت یەك لیست بن , بەڵام کەلتوور و مێژوو دەڵێت لیستی جیا بن , ڕاستی لای تۆیە!

## پێنجەم : بەشداری " رۆشنبیری " چەواشەکار لە پەرتەوازەیی

### دەروازە :

پرۆسەی داگیرکردن و دابەشکردنی کوردستان کەمتر لە دوو ساڵی ماوە تا سەدەیەك تەواو بکات , ئەو مێژووە هەم دەرەکی و عەسکەری بوو . ئەم فاکتەرە زۆر قسەی لە سەر کراوە , بۆیە لە کاوێژکردنەوە دوور دەکەوینەوە , ئەوەی لەم نوسینەدا قسەی لە سەر دەکەین داگیرکردنێکی ناوەکی ( کوردی ) و ئایدیۆلۆژیە . جگە لە حیزبی چەپی کوردی , رۆشنگەری چەپ وەك حیزبی چەپ دەیەوێ رووبەری کوردستان پاوان بکات , چونکە هێشتا تێنویتی نەشکاوە بەوەی حیزبی چەپ لەو سەد ساڵە بە سەر کوردی هێناوە لە هەر پێنج بەشی کوردستان.

لەم نووسینەدا خوێندنەوەیەکی هزری دەکەین لە سەر ستراتیژیەتی چەپی کوردی , هەتا گوتارەکەی لە بن و بۆتکەوە هەڵوەشێنینەوە . تاکی کوردی ناچار نەبێ بە دوای کڵاوی بابردووی جیهانی چەپ بکەوێت , چۆن لە ناوەڕاستی حەفتاکان بە دوای حیزبی چەپ کەوت , لە ئاکام ئەویش دوای خەباتێك بە قەد خەباتی شۆرشی ئەیلول , فەشەلی هێنا .

## دەسپێکی داگیرکردنی نوێ

لە دەسپێکی دروستکردنی دەوڵەتی عیراقی زۆرەملێدا , شێخ مەحموودی بەرزنجی لە ١٩١٩ هەتا شەڕی ئاوباریك شەڕی ئینگلیز و دەسەڵاتی عەرەبی کرد , بەڵام ئەفسووس فەشەلی هێنا ! لەولاوە زۆر لە ڕۆشنبیری کوردی وەك تۆفیق وەهبی و موحەمەد زەکی و سەعید کابان ...بەشداریان لە دروستکردنی دەوڵەتی عیراقی کرد هەروەها لە نێوخۆش بە نوسین نوسەری مەسەلەی ویژدان و لە خەوما و جەمال عیرفان ....کەوتنە ڕەخنەگرتنی حوکمڕانیەتی شێخ مەحموودی بەرزنجی وەك بڵێی دەسەڵاتی ئینگلیز و دەسەڵاتی عەرەبی هێندە دیموکراتین : کوردیان لە سەر دەست داناوە!

کەواتە لە دەسپێکی دەسەڵاتی کوردی لە سلێمانیدا , ڕەفیق حیلمی لە یاداشتەکانی دا دەنوسێت لەو کاتەی دەسەڵاتی مێجەرسۆن لە ترسی سوپای ئۆزدەمیری تورك خەریك بوو سلێمانی چۆڵ بکات , ئێمەی ڕۆناکبیری کورد خەریکی کەیف و سەیف و ڕابواردنی خۆمان بین !

شێخ مەحموود بە تەنیا نەیتوانی بەرامبەر ئینگلیز و دەسەڵاتی عەرەبی و ڕەخنەی ڕۆشنبیری کوردی خۆی بگرێت !

## دوا دەسەڵاتی کوردی

## ٢٠١٤-١٩٩٢

یەکەم حکومەتی کوردی ١٩١٨ لە پێش زۆر دەسەڵاتی دی ناوچەکە دامەزرا , وێڕای ئینگلیز و دەسەڵاتی عەرەبی , رۆشنبیری چەواشەکاری کوردی بەشدار لە ڕوخانی ئەو دەسەڵاتە !

کوردی باشوور لە مانگی ئابی دادێت ٩٣ ساڵە ململانێی لەگەڵ دەسەڵاتی عەرەبی سونی ١٩٢١-٢٠٠٣ و عەرەبی شیعە ٢٠٠٤-٢٠١٤ دەکات , بە ڕاستی مێژوویکی کۆنە .ئەو ململانێیە کورد لەگەڵ هەردوو جۆری عەرەب لە سەر( شوناس ) و (خاك ) بوو ! هەردوو جۆری عەرەب اعتراف بە شوناسی کوردی و خاکی کوردی ناکەن , بۆیە کورد لە ساڵی ١٩١٩ەوە تاکو ئێستا شەڕ لە سەر ئەو دووە دەکات .ئەو لایەنەی کێشەکە زۆری لە سەر نوسراوە , بۆیە بە لای داناچین , بەڵکو تەنیا قسە لە سەر شتێکی شاراوە دەکەین , کە هەندێ نوسەری عەلمانی کار لە سەر " ڕوخانی " کەسایەتی کوردی دەکەن , بە ناوی نەوەی ئیسلامین , لەوانە :

1. **ئەحمەد جزیری**
2. **ئەحمەدی خانی**
3. **مەحوی**
4. **مەلای گەورە**

ئەو چوار زاتە , كە مەلای رۆناكبیری كورد بوون . بە ( زمان ) و (دەق) بە پێچەوانەی ئیبن خەلەكان و ئیبن مستوّفی و شارەزووری ... بە زمانی كوردی و دەقی كوردی بێوێنەیان نوسی , بە جۆرێك ئێستاشی لەگەڵ دابێ نوسەری كورد ناتوانێ دەقێكی ئەوها بنوسێت !

هەبوونی چەند ئەدگارێكی فەلسەفەی یۆنانی , هیچ گومانێك لە سەر كەسایەتی ئایینی جزیری دروست ناكات , بەڵكو ئەو تێرم و ئەدگارانە زیرەكی جزیری دەگەیەنن , نەك كێماسی و شەقار هەروەها ئاگاداری جزیری، دووره شوێن لە فەلسەفەی یۆنانی كێشوەری ئەوروپا دەگەیەنێت!

هەموو شیعری خانی لە دوو سێ دێری كوردی كورتكراوەتەوە .خانی ئەوها بە خوێنەری كورد ناساندراوه , كە هاوار و فیغانی لە دەست میرانی كورد كردووه كە بۆچی یەكناگرن !

كەچی وێنەی خانی خوداپەرست لە میدیای كوردی بزره وەك بڵێی خانی تەنیا بنیاتنەری ناسیۆنالیزمە , بە جۆرێك وەپێش ناسیۆنالیزمی رۆژئاوا كەوتووه .لێرەدا پێویستە رەخنە لە رەخنەگری ئیسلامی كوردیش بگرم , كە بۆچی وێرای ئەو وێنەیە , وێنەی ئیسلامی جزیری و خانی بەیان ناكەن!

دەقەكانی مەحوی هەڵگری فەلسەفەی ئەوتۆن كە زۆر وەستایانە هەندێ ئایەتی قورئانی لە دەقە شیعریەكانیدا تەوزیفكردووه , ئەو وەستاییە تەنها لە دەقی شیعری مەلا خدر نالیدا دەبینرێ. جزیری، نالی , مەحوی سێكوچكەی تێگەیشتنی دروستن لە دەقی قورئاندا !

بەمدوایە كتێبی وا بلاّوكراوەتەوە كە جزیری تێرمەكانی فەلسەفەی یۆنانی لە شیعرەكانی بەكارهێناوه هەروەها مەحوی لە نێوان بوون و

نەبووندا گەنگەشە و کەڵکەڵەی کردووە ! ئەو عەدەمیتەی مەحوی قسەی لە سەر دەکات ئاسمان و ڕێسمان لە فەلسەفەی پوچگەرایی و بوونایەتی دوورە هەروەها هەوڵدان بۆ تەڵخکردنی وێنەی زەلاڵی مەحوییە.

ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینداری سەردەمی مەلای گەورەدا بە جۆرێك بووە کە تەواو جیاواز بووە لە بنەڕەتی پرانسیپەکانی قورئان , بۆیە ئەو زاتە بە پێچەوانەی سەردەمی خۆی بە کەرەستەی قورئانی کەوتووتە نەقدی مەلا و شێخی کوردی , بەڵام کام مەلا و شێخ ؟ کۆلکە مەلا و شێخی نەخوێنەوار! ئەو عەلمانیانە دەرك بەوە ناکەن کە لە فیقهی ئیسلامی کەسانێك هەن پێیان دەوترێت " مەلای بێ دین " ئەو جۆرە مەلایە نەك هەر مەعریفەی لێوەرناگیرێ هەتا لە ماڵی خۆیانیش ئازاد نین!

نوسەرێکی کوردی پاشخان شیوعی نامیلکەیەکی لە سەر مەلای گەورە نوسی تا بە خوێنەری سادە وا پیشانبدەن کە مەلای گەورە تێرمی نێو جیهانی چینایەتی مارکسی بەکارهێناوە! , سیستەمی ستەمکاری لە ڕووسیا و کوردستان یەکە , جا هەجووکردن بە وشانە مانای ئەوە نییە , کە خوا نەخواستە مەلای گەورە " مارکسی " بێت .پاش هەرەسی حوکمڕانی مارکسی دەرکەوت , حوکمڕانی مارکسی بەشێك بووە لە ستەم , بۆیە نەتەوەکان هەموو لەو حوکمڕانیە جیابوونەوە!!

مەلای گەورە ( دە ) ساڵ لە تەمەنی خۆی بە ( تەفسیری قورئان ) بردە سەر , هەتا لە هەندێ شوێنی تەفسیرەکەیدا بە " وشەی ئالایەق لە ڕووی قورئانەوە " هێرش دەکاتە سەر ئەو گەندەڵانە, ئەوەش یەك شت دەگەیەنێت کە مەلای گەورە زۆر لەو گەندەڵە سیاسی و دینی و کۆمەڵایەتیانە بێزار بووە.

٥. هەژار موکریانی

لە نێو خوێنەری کورددا پێش دەسەڵاتی کوردیدا , هەژار موکریانی وەك شاعیر و وەرگێری شەرەفنامە ناسرابوو .لە پاش مەرگی شوباتی ١٩٩١ , سێ کتێبی گەورە خوێنەری کوردی باشووری بە هەژارێکی تر ئاشناکرد .سێ کتێبەکە بریتی بوون لە :

١. فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە
٢. چێشتی مجێوەر –یاداشتنامە
٣. وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز

هەژار موکریانی بەو سێ شاکارە وێنەیەکی دی لە زاکیرەی خوێنەری کوردی دروستکرد .ئەو سێ شاکارە هەر چۆن بن زادەی عەقڵی مرۆڤن , بۆیە لە کێماسی بەدەر نین , بەڵام لە پڕێکا نوسەرێکمان لە ئەنتەرنێت بۆ دەرکەوت بە ناوی شێرکۆی هەژار موکریانی بە جۆرێك کەوتە نەقدکردنی کەسایەتی موکریانی وەك بڵێی هەژار موکریانی میرابۆی کوردیە یان موکریانی شاعیری مستەفا بارزانیە!

موکریانی بەو کێماسیانەش زۆر نوسەری عەلمانی کوردی هاندا " وەرگێرانی " قورئانی پیرۆز بخوێننەوە , چونکە کوردیەکەی هەژار لە کوردی نێو گوندەکان سەرچاوەی گرتووە , نەك شاری کوردی , تا کوردیەکەی هەژار فێرببن.

دوای نەقد کردنی ئەو فیگەرە ئایینی و نەتەوەییەی مێژووی کوردی , ئێستاش "ڕۆشنبیری" چەواشەکاری کوردی ڕەوشی ئێستاش بە ئایینی ئیسلامی گرێدەدات , وەك بڵێی ئەو هەموو پاشاگەردانیە , خودای گەورە خوڵقێنەریتی !

دكتۆر فواد ڕەشید لە وتاری ڕۆشنبیری چەواشەكار

**(سوكایەتیكردن بە ئایین و خودا وەك كەرەستەیەكی چەواشەكاری)**

چەندەها وێنە بە پاڵپشتی سەرچاوەوە دەخاتە ڕووا-٤ :

"لەم چەند ساڵانەی دواییەدا، تێبینی ئەوە دەكرێت كە لەنێو جەرگەی خەمە كۆمەڵایەتی و كێشە سیاسی و قەیرانە دارایی و كارگێڕییەكانی ژیانی ئەم خەڵكەدا، ماوە نا ماوەیەك چەند نووسەرو بەناو ڕۆشنبیرێك (بەرنامەیەك، وتارێك، كتێبێك، لێدوانێك) بڵاودەكەنەوە كە تیایدا-ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ- هێرش دەكەنە سەر ئایین و پێغەمبەرو سوكایەتی بە پیرۆزییەكانی زۆرینەی ئەم میللەتە دەكەن. هەندێ جار ئەم چەواشەكاری و سوكایەتییە لەم ئاستە دەرچووە لەنێو نامەی ماستەرو دكتۆراكانیشدا رەنگیداوەتەوە هەندێك جاریش بەدڕاندن و فڕێدانی خودی كتێبی قورئان ئەنجام دراوە:

١. ئەرێ ئەوە پێغەمبەربوو، یان (كریس پانیوكا)ی ڕاوێژكاری سیاسی دەسەڵاتی كاتی (CPA) بوو كە لەبەردەم لیژنەی بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبكردنی كوردستان گووتی:
((ناهێڵین كەس ئەو عەرەبانە دەربكا كە ڕژێمی سەدام زەوی پێداون یان خانووی بۆ دروستكردوون)- ڕۆژنامەی (میدیا) ژمارە (١٥٤) ٢٠٠٤/٢/٢٨، ل ١

٢. ئەرێ ئەوە پێغەمبەر بوو ڕازی نەدەبوو (١٠) ملیۆن دۆلار بۆ ئاوەدانكردنەوەی هەڵەبجە تەرخان بكرێت یان (ئەمەریكای بەناو دۆست)؟؟ ئەوەتا بەرپرسی كۆمەڵەی بەگژداچوونەوەی چەكی

کیمیایی له هه‌ڵه‌بجه‌ی شه‌هید ده‌ڵێت: ((بڕیاردرا له‌داهاتی نه‌وتی عێراق بڕی ١٠ ملیۆن دۆلار بۆ ئاوه‌دانکردنه‌وه‌ی هه‌ڵه‌بجه‌ ته‌رخانبکرێت، که‌چی ئه‌مه‌ریکا ڕه‌فزی ده‌کات و له‌ته‌کمیلکردنی جه‌یشی عێراق به‌کاریده‌هێنێت...)- ڕۆژنامه‌ی (میدیا) ژماره‌ (١٩٢) ٢٠٠٥/٥/٢٤، ل ٨.

٣. ئه‌رێ کێ له‌پشتی له‌شفرۆشان و بانده‌کانیانه‌وه‌ن. ئایین؟؟؟!!! ئه‌وه‌تا نووسه‌ری کتێبی (ئۆقیانووسێك له‌تاوان) ده‌ڵێت (حه‌تمه‌ن به‌رپرسه‌کان له‌پشتیانن و ئه‌گه‌ر ئێمه باس له‌وه بکه‌ین، دیاره که‌ زۆر ئاشکرایه‌ کرِیاری بالاّ ده‌ست هه‌یه‌و له‌هه‌موو دنیاشدا وایه‌ سه‌رمایه‌داری گه‌وره و به‌رپرسی گه‌وره له‌پشت ئه‌م باندانه‌وه‌ن، ده‌نا بازاڕیان گه‌رم نابێت)- ڕۆژنامه‌ی (جه‌ماوه‌ر) ژماره‌ (٢٤١) ٢٠٠٧/٩/١٧، ل ١٣.

٤. ئه‌رێ خه‌تای ئایینه‌ که‌ بڕی (٦٥٠) ملیۆن دینار بۆ تاقه‌ فلیمێك خه‌رج ده‌کرێت و دواتر، پاره‌که‌ له‌پرۆسه‌یه‌کی به‌هه‌ده‌ردانه‌دا، بزر ده‌بێت و که‌س به‌دروستی نازانێت چی به‌سه‌ر هاتووه‌؟؟!- ڕۆژنامه‌ی (هاوڵاتی) ژماره‌ (٦٢٠) ٢٠١٠/٤/١٨، ل ٨."

٥. ئه‌رێ ئه‌وه قورئان بوو یان سایکس بیکۆ و لۆزان به‌ سیاسه‌ت و فوه‌تی پرسی کوکس و مس بێل و ویلسن کوردی باشووریان به‌ عه‌ره‌بی سوننه و شیعه لکاند و به‌سته‌وه‌؟ ئێستاش ئه‌وه‌ی ئه‌و سێ که‌سه ( کیری ) ئه‌مریکی و (هێك)ی به‌ریتانی بۆ باشووری کوردستان ده‌نێرێن تا ده‌سه‌ڵاتی کوردی له‌ به‌غدا جیانه‌بته‌وه‌ :

Don't secede from Baghdad Authority!

له کۆتایی دەپرسم ئەو تەرزە نوسەرانە چیان لەم میللەتە هەژارە دەوێت : عەرەب و تورك و عەجەم خاکیان داگیردەکەن , لێناگەرێن دەوڵەتی کوردی لە مەریخیش دامەزرێت , سیاسیە کوردەکانیش لە سیەکانەوە هەتا کۆتایی هەشتاکان بە بیرۆکەی چەپبوون بیریان داگیرکردن , رۆشنبیری چەواشەکاریش خەریکە مێژووی کۆن و تازەیان دەشێوێنن!

بۆ بەس نییە ؟ ئێوە مەسئولن بە قەڵەم و بیرەکەتان وەك سیاسیەکانی تورك و فارس و عەرەب و بەشداری دەکەن لە داگیرکردنی کەسێتی کوردی ! ئێوەش داگیرکارن بەڵام داگیرکاری ئایدیۆلۆژی! لەمەش زیاتر ئایا کۆنگرەی دابڕان و ناوەندی سیکیولەری هەر بەردەوامی بە بیستەکانی سەدەی بیستەم نییە؟

## پاشەکی پێش کۆتایی

## کورد پێویستی بە ( لی کوان )-ە , نەك ( جۆزێف ستالین )!(

من کەسی خۆم باوەڕێکی سەد لە سەدیم بە چارەسەری قورئانییە , نەك چارەسەری هاوردە . چارەسەری قورئان چارەسەری ئیلاهیە , بە واتای دوورە لە هەموو لایەنگیریەك . خودا دەڵێت : یەك و تەبا بن , براوەن , هەروەها گەر پەیوەست بن بە کەنارگیری و پەرتەوازەیی , ئەو کەنارگیریی و پەرتەوازەییە لەناوتان دەبات ." ئەمە گوتاری قورئانە بۆ مرۆڤەکان , بەڵام ئەفسووس ئەوە سەدەیەك زیاترە , حوکمی خودا بەس لە نێو قورئان ماوەتەوە و مرۆی قورئانیی , مرۆی قورئانی کردارەکی لە دەسەڵات دوورە ! ئەمە لە لایەك , لە لایەکی تر , ستەم و داد پەیوەست نییە , تەنیا بە مرۆی موسڵمان , بۆیە هەر لە سەدەکانی بەرایی ئیسلام , کەسانێك دەبینین , کە بانگاشەی ئیسلامەتی دەکەن , گورگن بۆ گیانی ئیسلام خۆی , کەواتە (زار )بەهانای کەس نایەت , بەڵکو (کردار –کردەوە ) سەنگی مەحەکی موسڵمانبوونە .

تاك دادی دەوێت ! من وەك تاکێك چ لەوە بکەم , تۆ شەونوێژ دەکەی , بەڵام کە گەڕایەوە ماڵەوە لە گڵۆپی سووری ترافیك لایت دەدەی یان ڕۆنگ ساید لێدەدەی یان کە ڕۆژ بۆوە لە دکان قۆڵم دەبڕی.... ئەو هەموو هەڵەیە دەرهەق بە هاوڵاتی " پەرستنە نهێنیەك"ەکەت هەڵدەوەشێنێتەوە , چونکە خودا تەنیا کاری جوان قەبووڵ دەکات.

چـۆن هـەموو داگیرەکـان : عـەلمانی , کۆمۆنیسـت , نەتـەوەیی یـا " ئیسلامی مەزهەبی " بن تەواو دوورن لە دادگەری ئیلاهی لـە نێـوان جـۆری مرۆڤەکان , کاردانـەوەی حیزبـی سیاسـی کوردیش , بـە هـەمان شـێوە دوور بووە لە چارەسەری ئیسلامی ... دەزانی بۆ؟ چونکە هەردوولا دووربوونە لە چارەسەری لی کوان و نزیك بوونە لە چارەسەری جۆزێف ستالین!

لی کوان هەتا نەمرد بە دەگمەن نەبێ بە تاکی کورد ئاشنا نەکرا . ئەو مرۆڤە هەلگری هەر ئایدیۆلۆژیا و باوەڕێك بێت , توانی مرۆی سنگافۆرەیی دروسـت بکـات هـەروەها تـوانی دەولـەتێکی دەولەمەنـد دابمـەزرێنێت . پرۆسەی نەتەوەسازیی و دەولەتسازیی لە سەنگافورە بەرپا کرد . ئەو شەڕی دەرەوەی سـەنگافورەی نـەکرد , بـەلکو لـە سـەنگافورەوە دەسـتی پێکـرد ! دەزانی (لی) چۆن ئەوەی کرد ؟ زۆر هۆکاری پەرتەوازەیی لە ولات بـە زەبـر لـە نێـوبرد . هـەتا نزیکـەکانی خـۆی جیـا لـە (مـاو و شۆرشـی رۆشـنبیری ) ڕاپێچی زیندان کرد . ئەو هۆکارانەی بە ڕاستی دەرگا کردنـەوە بـوون لـە ( فیتنەی نووستوو ) , لە ولات بنەبڕ یا کەم و یاساغی کرد , بۆیـە لـە ئاکام دەولەتێکی بەهێزی لە ئاسیا دروستکرد و ئۆبامای ناچارکرد , پێشوازی لـەو شاسوارە پالەوانە بکات !

ئایـدیۆلۆژیا و حـوکمڕانی جۆزێـف سـتالین ١٩٢٤-١٩٥٣ , خـراپترین سـی سالی حـوکمڕانی بـوو بـۆ سـۆڤیەت و کـورد . نیکیتـا خرۆشـۆف , خەلیفـەی ستالین , پەردەی لە سەر زۆربەی تاوانەکانی ستالین لـە سـۆڤیەت و دەرەوە هەلمالی ( بـۆ تاوانـەکان بڕوانـە مێـژووی ڕەشـی کۆمـۆنیزم و گزیـری ...) . ئەوەی خرۆشۆف قسەی لە سەر نەکرد , تاوانەکانی ستالین بوو دەرهەق بـە کوردی زۆربەی بەشەکان :

١- كورد ئوممه نییه , چونكه ئابووری هاوبەشی نییه!
٢- هەر له پاش مردنی لینینین , كەوته هەڵوەشانەوەی " كوردستانی سوور " هەروەها حیزبی شیوعی سۆفیەت هەر له سەردەمی لینینەوه به بیانووی ئەوەی كورد لەو نەتەوانەیه كه غەوارەن له ڕووسیا , بۆیه دەبێ به سەر كۆمارەكان پەرت بكرێن , مەرگ دەرفەتی به لینین نەدا , بۆیه ستالین كەوته پەرتەوازەكردنی كوردی موسڵمان , نەك ئیزیدی به سەر كۆمارەكانی سۆفیەتدا , بەوەش ئەو بەشەی خاكی كورد له ڕووسیا شوێن بزر كرا !
٣- لینین هەر له سەردەمی خەباتی كەمالیەكان دا , پێشوازی له نوێنەری ئەتاتورك له كۆنگرەی باكۆ كرد . سۆفیەتیش وەك كەمالیەكان دوژمنی ( پەیمانی سیڤەر ) و حوكمڕانی ئیسلامی بوو , بۆیه هەر ساڵێك دوای مردنی لینینین , سوپای سووری سۆفیەت به ئیمزای ستالین بەشداری كرد له كوژاندنەوەی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران ١٩٢٥- و شۆڕشی ئاگری داغ ١٩٢٧-١٩٣١ ! به ناوی ئەوەی شۆڕشەكانی كورد شۆڕشی دەرەبەگی و بەرهەمی ئیمپریالی و هێزەكانی گەڕانەوەی خەلافەتن!!
٤- جۆزێف ستالین به بیانووی هەڵگیرسانی سێیەم جەنگی جیهانی پشتی له ئازەری ئیران و كوردی ڕۆژهەڵات كرد , ئەو بیانووەی ستالین زۆر بێ بنەما بوو , ئەگەرنا بەرانبەر ئەو پشتلێكردنه , پەیمانی نەوتی لەگەڵ قەوام سەڵتەنەی ئیران بەست بوو.
٥- بیرۆكەی كورد ئوممه نییه , له عیراقدا گۆڕدرا بەوەی كورد نەتەوە نییه ! لەو ڕوانگەوە كورد له باشووری كوردستان له

١٩٣٤ەوە هەتا ١٩٩٠ باجی نەخۆشی ئایدیۆلۆژی چەپی دا , جگە لە کۆنفرانسی دابڕان –ئازاری ٢٠١٥ , بیرۆکەی چەپ لە باشوور ناو و هەژموونی شەرم بوو , بۆیە نەما بوو!

٦- هەر بە ناوی هاوردەکردنی ئایدیۆلۆژیا بۆ ڕۆژهەلآت , کوردی ڕۆژهەلآت و باکوور و ڕۆژئاوا تووشی حالی ئایدیۆلۆژی بوون هەر لە پەنجاکان هەتا ئێستا ....................بۆیە دەستیان لە بزافی چەپی بەر نابێت !!!!!!!!!!!!!!!!!

لی کوان لە هیچەوە دەولەتی سنگافۆرەی دامەزراند , هەرچی ستالین بوو " دەرمانێکی ئیکسپایەر " بوو بۆ ڕەوشی سۆڤیەت هەروەها ساید ئیفێکت –کاریگەری لاچەپ-ی هەبوو بۆ کورد هەتا گۆرپاتچۆڤ لە ١٩٩٠ لە بنەڕەتەوە کۆتایی بە حوکمڕانی کۆمۆنیستی هێنا – ئەومیە کورد دەولەتی نییە , چونکە هەر خەریکی پەرستنی ئایدیۆلۆژیا و مەرقەدی لینین و ستالینە !

سەیرم بە دێت دکتۆر نەجمەدین کەریم لە چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی ڕووداو دا , ئایاری ٢٠١٥ , گوتی : هەموو پارتە سیاسیەکانی باشووری کوردستان دەتوانن لە ژێر چەتری یەك حیزب کۆببنەوە , چونکە هەموو پاشخان سۆشیالیستی و ستالینین!

## دەرئەنجام :

# بەدیلی پەرتەوازەی ئیسلامی

پەرتەوازەی ئیسلامی زادەی دنیایی بزافی ئیسلامیە , ئەگینا خۆ پەیوەستکردن بە پرانسیپەکانی ئیسلام و پێگیری پێکردنیان , ئەو پەرتەوازمییە ناهێلێت .

ئەگەر ئایدیۆلۆژیا لە هەلبژاردن دوورخرێتەوە , دەنگدان لە سەر دەسپاکی و دادوەری بکرێت , ئەو نیفاقە لە کەسایەتیەتی دەنگدەر دروست نابێت , نەك ژمارەی دەنگەکان تێکەلّ یەك بکرێن و دەنگی عەوام و زانا لە یەك تەرازوو دابنێن. شوان و گاوان و سەپان چ پەیوەندیان بە ولاّت بەڕێوەبردن هەیە!!

لە لایەکی دی , هەژموونی ڕۆحی و سیاسی سەرکردە وەیکردووە ڕۆلّی ئایدیۆلۆژیا و فەلسەفەی سیاسی لە حیزبدا گوم ببێت .لە فەلسەفەی ئیسلامدا دوو قورئان هەیە , قورئانێکی کەلامی ئیلاهی کە پرانسیپ و باوەڕی ئیسلامی تاك لە خۆدەگرێت هەروەها قورئانێکی کردەوەیی مرۆیی.ئەم تێگەیشتنەش لەم فەرموودانە سەرچاوەی گرتووە : " خۆشەویست خۆی قورئانێ بوو لە نێو خەلّکدا " , " ئاکاری خۆشەویست قورئانی بوو ." هەروەها لە بوخاری و موسلیم و ئیبن هیشام هاتووە " مەدینە بە هۆی حزوری خۆشەویستەوە ببووە پێغەمبەرستان " و " خوا باشی ئەدەب داوم " ...هەروەها قورئانیش لە بارەی خۆشەویستەوە دەلّێت : " قسەکانی پێغەمبەر وابەستەی سروشی ئیلاهین"

کەواتە لە کاروباری ولاتدا , لە ڕوانگەی قورئانەوە نەوکاتە تەناهی و دادوەری بەرپا دەبێت , کە قورئانی کەلامی ئیلاهی ببێتە فەلسەفە و پرانسیپی دەولەت , لەوانە دەولەتی کوردی. مرۆڤەکانیش بە تایبەتی مرۆی کورد بە هەردوو ڕەگەزەوە خۆیان ببنە قورئانی کردەگی تا گەندەلی لە جوەگەکانی دەسەلات نەمێنێت و ولات ببێتە ولاتی هەمووان و هەمووان بە ئاسوودە بژین.

ڕووداوی مێژوو , گەر وەك تەبەری , نەك ئیبن خەلدون تەماشاکرێت , گومان دروست دەکات , بەلام گەر بە ستاندەر و پێوەری قورئانی بپێورێت , مرۆ ئاسوودە دەکات . هەردوو ( دوهلی —مفتی زەمانی بوخاری ) و ( خالیدی والی بوخارا لە زەمەنی بوخاری ) باس لە گەندەلی کاربەدەست دەکەن , بۆیە مێژوو هیچ ئیزافەیەکمان پێ نابەخشن , بەلکو ئەوە قورئانە لە هەر ڕووداوێکی مێژوو ئاگادارمان دەکاتەوە .

لە هەمووش گرینگتر بە دەستهێنانی کاروباری ولات خەمێکی ترە کاربەدەست کاری بۆ دەکات بۆیە مێژوو هەتا سەدەی شازدە لە ئەوروپاش مێژوویکی مالباتیی و ئەمیرەکان بوو . بە ڕاستی بە ڕێوەبردنی ولات بە عەقلی دوور لە لایەنگیری و نزیك لە پسپۆری و توانایی , گوتاری پەیامی خودایە , کە ولاتێکی دادوەری دەوێت بۆ مرۆڤی کورد و هەر مرۆڤێك .

وتەی پەرتەوازەیی بە پێوەری قورئانی جێی لە کۆمەلگا نابێتەوە , بەلکو هەر لە زهنی کاربەدەستان دەمێنێتەوە , چونکە قورئان موسلمان بە باشترین ئومەت دادەنێت , وتەکەش بە خراپترین ئومەت ...

خودایە , پەروەردگارا داواکارم لەم هەولەمدا ڕاستیم پێکابێ , گەر وانەبێ لە هەر وشەیەك پەشیمانم .

## ژیاننامەی زانستی

## (( پرۆفیسۆری یاریدەدەر سەلام ناوخۆش ))

**یەكەم: ژیاننامە**

لەساڵی ١٩٦٦ لەدێی زێبارۆك لەدایكبووە، لەساڵی ١٩٦٩ەوە هاتوونەتە هەولێر. خوێندنی سەرەتایی لە ١-٣ لە سەرەتایی"زاگرۆس" و لە ٤-٦ لە سەرەتایی"مەولەوی"تەواو كردووە. قۆناغی ناوەندی لە"قوتەیبە"تەواو كردووە، ئامادەیی لە هەڵمەتی كوڕان تەواو كردووە.

لەساڵی ١٩٩٠ بەشی ئینگلیزی لە ئادابی زانكۆی سەلاحەددین وەرگرتووە، لەساڵی ١٩٩٦ لەهەمان بەش ماستەری تەواو كردووە. لەساڵی ١٩٩٦ هەتا كۆتایی ٢٠٠٣ لە بەشی ئینگلیزی ئادابی دهۆك مامۆستا بووە. لە ٢٠٠٤ هەتا ئێستا مامۆستایە لەبەشی ئینگلیزی پەروەردەی بنیاتی زانكۆی سەلاحەددین.

**دووەم: نازناوی زانستی**

- ✓ لە ١٩٩٦/٦/٣٠ مامۆستای یاریدەدەر.
- ✓ لە ١٩٩٩/١/٢٠ مامۆستا.
- ✓ لە ٢٠٠٥/٢/٥ پرۆفیسۆری یاریدەدەر.

## سێیەم: چالاکییە ئەکادیمییەکانی

- لەساڵی ١٩٩٨ بە توێژینەوەیەك بەشداری لە یەکەم کۆنفرانسی زانکۆی دهۆك کرد.
- لەساڵی ١٩٩٩ بەتوێژینەوەیەك بەشداریی لە یەکەم کۆنفرانسی زانستی زانکۆی سلێمانی کرد.
- لەساڵی ٢٠٠٠ بەشداریی لە یەکەم کۆنفرانسی خوێندنی باڵای زانکۆکانی هەرێم کرد.
- لەساڵی ٢٠٠٥ بەتوێژینەوەیەك بەشداریی لە کۆنفرانسی زمان کرد.
- لە ساڵی ٢٠١٠ بەتوێژینەوەیەك بەشداریی لە کۆنفرانسی زمان و ئەدەبی کوردی لە زانکۆی کوردستان- سنە کرد.

## چوارەم : توێژینەوە ئەکادیمییەکانی:

1- Sequence of Descriptive Adjectives in kurdish

گۆڤاری ئوستاد- زانکۆی بەغدا

2- A contrastive study of Ellipsis in kurdish and English

گۆڤاری زانکۆی دهۆك

3- Northern Kirmanji kinship terms

گۆڤاری زانکۆی دهۆك

4- Polysemy in Kurdish

گۆڤاری دهۆك

5- Kurdish Honorifics system

گۆڤاری زانكۆ- سەلاحەدین

6- Ambiguity in Kurdish

7- Kurdish Diminutive system K گۆڤاری زمان- كۆلێژی زمان

8- Classifying &Translating Idioms گۆڤاری زانكۆی دهۆك

٩- دوا ژمارەی گۆڤاری زانكۆ –هەولێر

١٠- گۆڤاری سنە –رۆژهەلاتی كوردستان

١١- ئەندام بووە لە چەندین لێژنەی تاوتێكردنی ماستەر لە زانكۆكانی هەرێم.

**پێنجەم: كتێبەكانی**

**أ- فەرهەنگ نووسین**

١- فەرهەنگی ئۆكسفۆرد ئینگلیزی- كوردی .

٢- فەرهەنگی ئۆكسفۆردی نوێ – سۆرانی- بادینی- ئینگلیزی .

٣- فەرهەنگی سیدرا ، كوردی-عەرەبی- ئینگلیزی.

٤- فەرهەنگی هیوا ، ئینگلیزی- كوردی .

٥- فەرهەنگی هەراشان-"بەهاوبەش" .

٦- فەرهەنگی زاراوەی لەشكری،"بەهاوبەش".

٧- فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی،"بەهاوبەش" .

٨.فەرهەنگی زمانەوانی ناوخۆش

٩.فەرهەنگى ياسايى ئۆكسفۆرد

١٠. فەرهەنگى كارگێڕى ( بە هاوبەش )

**ب:زمانناسى**

١- زمانناسى و هەندێ بابەتى زمانناسى كوردى .

٢- پوختەيەك دەربارەى زمانناسى .

٣- ئايين و زمانناسى .

٤- واتاسازى"بەهاوبەشى لەگەڵ م.نەريمان".

٥- سياسەتى زمان و زمانى سياسەت

٦- سارا ، بۆ فێربوونى زمانى ئينگليزى.

٧- حەوت بەرگى هەشت سەد لاپەڕى بە ناوى (زمانەوانى) لەگەڵ د. نەريمان خۆشناو

٨. كۆبەرهەمى زمانەوانيم ( چوار بەرگە زياتر لە هەزار لاپەڕميە )

٩-خوێندنەوەى پراگماتيكى قورئان

١٠-زمانى قورئان

**جـ: وەرگێڕان**

١- قورئان و زانستى نوێ- لەئينگليزييەوە.

٢- كوردو كوردستان لەنێوان بەرداشى داگيركاران- لەئينگليزييەوە.

٣- كرۆنۆلۆژياى مەسەلەى ويلايەتى موسڵ- لەئينگليزييەوە.

٤- یاسا بنەڕەتییەکان- لەئینگلیزییەوە .

٥- نۆ چیرۆك لەبارەی خەلکەوە- .............

٦-دەقەکانی سیفەر لەئینگلیزییەوە

٧- یاسا بنەڕەتییەکانی‌پرستەی کوردی ،ماستەرنامەکەی پرۆفیسۆر وریا عومەر ئەمین .

**د: شرۆڤەی مێژووی سیاسی/ نووسین**

١- کوردستان چۆن داگیرکراو دابەشکرا .

٢- هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ .

٣- سێکوچکەی هەرەس .

٤- مافی مێژووی غەیرە کورد بەسەر کوردستانەوە .

٥- ململانێی ئینگلیزو تورك .

٦- شێخ مەحموود و سێ ئەفسەرەکەی داگیرکەران .

٧- ئاین و ناسیۆنالیزم .

٨-فەشەلی عەلمانییەکان و غیابی ئسلامییەکان

٩-زەردەشتیەتی نوێ

١٠-پرۆسەی داگیرکردن و دابەشکردنی کوردستان

١١-کوردۆلۆژی بەهاوبەش

١٢.گوشتاری کورد یا ئەرمەن ؟

١٣.مێژووەك لە پەرتەوازەیی...

١٤.دوالیزمی نەتەوەیی

١٥ . ئافرەت و کەلتوور

١٦-سەربردەی پێغەمبەرەکان

١٧-قورئان و سیكیولەری كوردی

١٨- كورد و ئیسلام

١٩. دەروازەیەك بۆ ڕۆژئاواناسی

٢٠. ئەفسانەكانی سیكیولەری كوردی

**هـ-كتێبی ئەدەبی:**

١- ڕەخنە و ڕۆمان و ڕۆژنامەگەریی ئیسلامی .

٢- موحەمەد پێغەمبەر لە شیعری كلاسیكی كوردی...

٣- شیعری هاوچەرخی كوردی

٤- ناسیۆنالیزمی ناوەكی و دەرەكی لە شیعری كوردیدا

**كتێبی عەرەبی**

١-دراسه عن احتلال و تقسیم كردستان

**كتێبی ئینگلیزی**

١- Eight Kurdish Studies

٢- An Introduction to English Grammar

٣- Oxford Grammar

ئێستا مامۆستام لە بەشی ئینگلیزی پەروەردەی بنیات هەروەها خاوەن ئیمتیازی یەكەم گۆڤاری تایبەت بە زمانم(زمانناسی) , كە ١٦ ژمارەی لێ دەرچووە هەروەها سەرۆكی ڕێكخراوی (زمانناسی بۆ پەرەپێدانی زمانی كوردی)م.